ZANYAR
bookstore

# هونەری وەڵامدانەوە

# وەڵامە جوان و دەمکوتکەرەکان

## بەرگی دووەم

ئامادەکردنی
ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی



# تەنها بەناوی خودا

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ ئەو خودایەی کە بەر لەبوون ئەو هەبووە، هیچ بونێک بەر لەبوونی ئەو بوونی نەبووە، زانایە بەهەمووشتێ، بەوەی هەبووە، بەوەی کە هەیە، بەوەی کە نیە، بەوەش کە نیە بەڵام ئەگەر هەبوایە چۆن دەبوو.

درود و سەلام لە سەر ڕابەڕ و پێشەنگ و سەرمەشقی مرۆڤایەتی، خۆشەویست و نوری چاومان (محمد) (ﷺ).

ڕەزا و ڕەحمەتی پەروەردگار برژێ بەسەر یارو یاوەران و زانایان و تەواوی شوێنکەوتوان هەتا ڕۆژی دوایی.

دوای ئەوەی کە بەرگی یەکەمی (وەڵامە جوان و دەمکوتکەرەکان) کەوتە بەردیدی خوێنەران و پێشەوازییەکی گەرمی لێکرا، لەلایەن زۆرێک لە خوێنەران هەم لە تۆڕی کۆمەلایەتی فەیسبوک هەمیش لەرێگەی پەیوەندیەوە داوام لێکرا کە کار لەسەر بەرگی دووەمیش بکەم، ئەمەش بووە پاڵپشت و هاندەرێکی زۆر باش بۆ ئەوەی بتوانم لە ماوەیەکی کورتدا بەرگی دووەمیش تەواو بکەم، لەم بەرگەشدا هەوڵمداوە ڕاستەوخۆ نەچمە سەر وەڵامەکان، بەڵکو لەسەرەتادا بەچەند هەنگاوێک خوێنەر ئاشنا دەکەم بەوەی کە چۆن بتوانێ ببێتە خاوەن وەڵامی جوان و دەمکوتکەر، دواتر بە لەبەرچاوگرتنی ڕۆڵی دیاری میدیا و ڕاگەیاندنکاران لە ڕۆژگاری ئەمرۆماندا چەند هەنگاوێکی کورتمان سەبارەت بە چۆنیەتی وەڵامدانەوەی

ڕاگەیاندنکاران خستۆتەڕوو، پاشانیش ڕێگەیەک لە ڕێگاکانی وەڵامدانەوەم باسکردووە کە ئەویش وەڵامی پرسیار بە پرسیارە، لە دوای ئەوانەش بە دەیان نمونە و ڕووداوم باسکردووە کە پڕن لە وەڵامی جوان و دەمکوتکەر، هاوکات پڕن لە پەند و ئامۆژگاری بۆ کەسانی خاوەن عەقڵ و ژیری.

جارێکی تر سوپاس بۆ پەروەردگاری مەزن کە هیچ کارێک بەبێ دەرفەتی ئەو بە کۆتا نایەت.

سوپاس بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە بەسەرنجێکی بچوکیش بێت هاوکارم بوون.

سوپاس بۆ ئەو کەسانەی کە یارمەتی دەرم بوون لە دۆزینەوە و گەیشتن بە چەند وەڵامێکی جوان و دەمکوتکەر.

سوپاس بۆ ئەو کەسانەی کە لە هەڵەی تایپی بەرگی یەکەم ئاگاداریان کردینەوە.

خوێنەری خۆشەویست دەتوانی لە ڕێگەی ئەم ژمارە موبایلەوە (٠٧٥٠٤٦٦٩٦٧٠) یاخود لە ڕێگەی ئەکاونتی تایبەتمەوە لە فەیس بووک (Awder Ahmed Qamtarani) بەرگی داهاتووی کتێبەکەمان دەوڵەمەند بکەن و ئێوەش ئەگەر بە وشەیەکیش بێت خزمەتێک بە ئەدەب و ڕەوانبێژی و پەرتووکخانەی کوردی بکەن.

## چۆن دەبیتە کەسێکی خاوەن وەڵامی دەمکوتکەر و خێرا؟

بێگومان هەمووومان ئارەزووی ئەوە دەکەین کە لەنێو هاورێکانماندا زاڵ بین بەسەر ئەو پرسیارانەی کە ئاڕاستەمان دەکرێن، بە شێوەیەکی زۆر ئاسان و بەجوانی وەڵامیان بدەینەوە، نەوەک لەبەرامبەر سادەترین پرسیار دابمێنین و وەڵامێکی شیاومان بۆی نەبێت، ئەمە لە کاتێکدا کە بوون بە خاوەنی ئەو جۆرە وەڵامانە لێزانی و توانایەکە کە هەموو کەسێک دەتوانێ بە هەوڵ و ماندووبوونی خۆی پێی بگات و بە دەستی بهێنێت، هەوڵ دەدەین لەم بەرگەدا چەند لایەنێک لە لایەنەکانی فێربوون و بەهێزکردن بۆ ئارەزوومەندانی ئەو جۆرە وەڵامانە بخەینەڕوو.

**هەنگاوی سەرەتا بۆ ئەوەی ببیتە کەسێکی خاوەن وەڵامی دەمکوتکەر:**

بۆ ئەوەی ببیتە کەسێکی سەرکەوتوو لە وەڵامەکانتدا، تاوەکو وەڵامەکانت جێگای خۆیان بگرن و کەسی پرسیارکەری پێ ڕازی بکەیت، یانیش ئەگەر ویستی سوکایەتیت پێبکات و بتشکێنتەوە، ئەوا تۆ دەمکوتی بکەیت، وای لێبکەیت جارێکی تر جورئەتی ئەوە نەکات کە پرسیاری هاوشێوە لە تۆ بکات و هەوڵی شکاندنەوەت بدات.

ئەمانەی خوارەوە چەند هەنگاوێکن کە هەر کەسێ ئارەزووی ئەو جۆرە وەڵامانە بکات، یاخود ویستی ئەوەی هەبێت کە ببێتە کەسێکی خاوەن وەڵامی دەمکوتکەر، یانیش ئەو بەهرەیەی تێدا هەیە بەڵام دەیەوێ زیاتر پەرە بەخۆی بدات، دەبێ پەیڕەویان بکات، تاوەکو ببێت بەو کەسایەتیە کە خۆی دەیەوێت.

- **خوێندنەوەی زۆر:** ئەم هەنگاوە هەنگاوێکی تیۆرییە بۆ گەیشتن بە ئاستێکی باڵا و بەهێز.

بێگومان خوێندنەوە لە گرنگترین ئەو هەنگاوانەیە کە پێویستە ئارەزوومەندی ئەو جۆرە وەڵامانە پەیڕەوی بکات، چونکە لە ڕێگەی خوێندنەوەوە سود لە ئەزموونی کەسانی تر و ئەو ڕووداوانە وەردەگرێت کە بە درێژایی مێژوویی مرۆڤایەتی ڕوویانداوە.

ڕەنگە هەندێک جار ئەو ڕووداوانە دووبارە ببنەوە، ئەزموونی کەسایەتیەکانیش لە دەربازبوونیان لەو جۆرە ڕووداوانە شارەزاییەکی باش بە خوێنەر دەگەیەنن.

لەگەڵ ئەوەشدا خوێندنەوەی زۆر بەبەردەوامی وشەی نوێ لە فەرهەنگی کەسایەتی خوێنەر زیاد دەکات، ئەمەش بۆ خوێنەر دەبێتە پاڵپشتیەکی بەهێز، چونکە زۆرجاران مرۆڤ کاتێک ڕووبەڕووی پرسیارێک یان هەڵوێستێک دەبێتەوە، ڕەنگە لەبیری خۆیدا وەڵامێکی باش و شیاوی بۆ ئەو پرسیارە لابێت، بەڵام نازانێ چ وشەیەکی بۆ بەکاربهێنێ، تا وەڵامەکەی جێگای خۆی بگرێت، بەڵام ئەگەر هاتوو

فەرهەنگی وشەی ئەو کەسە بەهێزبوو، زانی کامە وشە زیاتر کاریگەری لەسەر کەسی بەرامبەر دروست دەکات، زۆر بە متمانەشەوە چەند وشەیەک ڕیز دەکات و کەسی بەرامبەری بێ دەنگ دەکات.

- **کۆمەڵایەتیبوون:** ئارەزوومەندانی ئەو جۆرە وەڵامانە پێویستە کەسانی کۆمەڵایەتی بن، بەردەوام بەشداری کۆڕ و چالاکی و کۆبونەوە کۆمەڵایەتیەکان بن.

ئەم هەنگاوە هەنگاوێکی کردارییە، ڕەنگە هیچی وای لە خوێندنەوە کەمتر نەبێت لە ڕووی گرنگیەوە، چونکە کۆمەڵایەتیبوون وا لە کەسایەتی مرۆڤ دەکات کە شارەزای سروست و ئاستی کەسانی دەوروبەر ببێت، کە ئەوەش بە خاڵێکی زۆر گرنگ دادەنرێت، چونکە هەر کات تۆ سروشتی کەسی بەرامبەرت بە باشی خوێندەوە، زۆر بە ئاسانیش دەتوانی ڕووبەڕووی ببیتەوە، چونکە تۆ پێشتر شارەزای خاڵی لاواز و بەهێزی ئەو کەسایەتیە بوویت، دەزانی بە کامە وشە دەیگریت، دەزانی بە چی توڕەدەبێت، بەچی بێ دەنگ و دەمکوت دەبێ...لەگەڵ ئەوەشدا شارەزای خاڵە بەهێزەکانی ئەوی، دەزانی ئەگەر ئەو وشەیەی بۆ بەکاربهێنی لە قازانجی ئەو دەبێ، دەزانی کە لە چ لایەنێک بەهێزە... هەموو ئەوانەش لە ڕووی بەشداری کردن لە چالاکیە کۆمەڵایەتیەکانەوە بە دەست دەهێنرێن.

جگە لەوەش بەشداری کردن لە چالاکیە کۆمەڵایەتیەکان ئەزموونی کەسانی تریشت نیشان دەدات، چونکە زۆر جاران تەنها لەیەک بۆنەی کۆمەڵایەتی ڕەنگە گوێبیستی چەندان وەڵامی سەرنج ڕاکێش و جوان ببیت، وشەی جیاواز، پرسیاری جیاواز، وەڵامی جیاواز، بەتایبەتیش لەلایەن کەسە بەتەمەن و خاوەن ئەزموونەکانەوە.

**هاوڕێیەتی کردنی زانا و دانایان:** هاوڕێیەتی کردنی کەسانی زانا و داناش یەکێکە لەو هەنگاوە گرنگانەی کە وات لێدەکات ببیتە کەسێکی خاوەن توانا لە وەڵامدانەوە و دەمکوتکردنی کەسی بەرامبەر، چونکە زانایان دەزانن چی دەڵێن و چ کاتێک قسە دەکەن، شتێک ناڵێن کە بێ کەڵک و سود بێت و شوێنی خۆی نەگرێت، هەروەها دەزانن لە چ کاتێکدا بێ دەنگ دەبن، هەمیشە لە قسەکردنیان پەند وەردەگری، لە بێ دەنگیشیان ئامۆژگاری.

هەمیشە دووربکەرەوە لەو کەسانەی کە جگە لە وتەی بێ سەروبەر و بێ واتا شتێکی تر بە دەمیاندا نایەت، چونکە هەمیشە مرۆڤ سروشتی ئەو کەسانە دەگرێ کە بەردەوام هامشۆیان دەکات، بۆیە با دۆستانت کەسانی دانا و تێگەیشتوو و خاوەن لێهاتوویی و توانا و قسەی نەستەق و وتەی بەهێز و بەپێز بن، تا تۆش سروشتت وەکو ئەوانی لێ بێت و سود لە تواناکانیان ببینی و هەمیشە وتەی و جوان و سەنگینیان لێوە فێربیت.

- **دیاریکردنی کاتی گونجاو بۆ وەڵامدانەوە:** قسەکردن کردارێکی ئاسانە، هەر کات بتەوێ دەتوانی قسەبکەیت، بەڵام ئایا ئەو کاتەی کە تۆ قسەکە دەکەیت، قسەکەت شوێنی خۆی دەگرێت؟ ئایا ئەو وەڵامەی کە تۆ دەتەوێت بیدەیتە کەسی بەرامبەر کاتەکەی شیاوە؟ بۆیە هەڵبژاردنی کاتێکی دیاریکراو بۆ دەمکوتکردنی کەسی بەرامبەر، یەکێکە لە هەنگاوەکانی فێربوونی ئەو هونەرە.

ڕەنگە کەسی بەرامبەرت پرسیارێ بوروژێنێ، بەڵام ڕاستەوخۆ دوای پرسیارەکە لە دانیشتنەکە دەبێتە ژاوەژاو، تۆ دەبێ چاوەڕوان بکەیت، تا کەش و هەوای دانیشتنەکە ئارام دەبێتەوە، ئەوسا دەڵێی: برایان، یان جەماعەت، ئەوە فڵان دەڵێ (پرسیارەکەی ئەو بە زمانی خۆت لە کەسەکە نوێ دەکەیتەوە) بەڵام ئەو بێ ئاگایە لەوەی کە (وەڵامەکەی خۆت دەردەبری)، بۆ ئەوەی لە یەک کاتدا هەم گوێبیستی پرسیاری ئەو، هەمیش وەڵامی تۆ بن.

بۆنموونە: کەسێک لە مەجلیسێکدا دەڵێ: (پێغەمبەری ئیسلام کە سێکی شەهوانی بووە، هەرچی کچی جوانە لە خۆی مارەکردووە!!) بەڵام بەم پرسیارە ژاوەژاوێک لەنێو مەجلیسەکە دروست دەبێت، تۆ وەڵامی خۆت هەڵبگرە، تا دانیشتنەکە ئارام دەبێتەوە، ئەوسا بڵێ: (جەماعەت، فڵان دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) کەسێکی شەهوانی بووە، هەرچی کچی جوانە لە خۆی مارەکردوە، بەڵام دیارە بە حەیاتی

خۆی شتێکی لەسەر پێغەمبەر نەخوێندۆتەوە و گوێبیست نەبووە، دەنا دەیزانی جگە لە عائیشە هەموو خێزانەکانی تری پێشتر هاوسەرگیریان کردووە).

- **شەرم نەکردن:** یەکێک لە هەنگاوەکانی تر ئەوەیە کە ئارەزوومەندی ئەو جۆرە وەڵامانە پێویستە کەسێکی چاوکراوە و خاوەن بوێری بێت، شەرم لە دەربڕینی وەڵامەکانی نەکات، چونکە وەڵامەکەی هەر چەند بەهێز و بەپێز بێت، ئەگەر شەرمی لەگەڵ دابوو، یان لە کاتی وەڵامەکەیدا سەری دانواند بۆ کەسی پرسیارکەر، ئەوا وەڵامەکە شوێنی خۆی ناگرێت، ڕەنگە بە پێچەوانەوەش بۆ سەر خۆی بگەڕێتەوە.

- جیاکاری لە نێوان وەڵامی تاک و گشتی: یەکێکی تر لەو هەنگاوانەی کە ئارەزوومەندی وەڵامی دەمکوتکەر کاری لەسەر بکات، پێویستە جیاکاری بکات لە نێوان وەڵامی تاک و وەڵامە گشتیەکان، چونکە ئەگەر وانەکات هەمیشە دووچاری کێشە دەبێت و هەرگیزیش وەڵامەکەی نەک هەر جێگای خۆی ناگرێت، بەڵکو هەمیشە دەبێتە خاڵێکی لاواز لەسەری، ڕەنگە زۆر جارانیش دووچاری کێشەی بکاتەوە.

بۆنمونە: کەسێک دەیەوێ لە دانیشتنێکدا لە کەسایەتی تۆ بدات و بتشکێنێتەوە، تۆش لە جیاتی ئەوەی وەڵام بۆ کەسایەتی خودی کەسەکە بدەیتەوە و قسە لەسەر کەسایەتی ئەو بکەیت، دەپرژێیتە

سەر کەسایەتی خانەوادەی کەسەکە، باسی باوکی، دایکی، خوشکەکانی...دەکەیت، ئەمە ڕاستەوخۆ تۆ دووچاری کێشە دەکات و بەهیچ شێوەیەک لە وەڵامدانەوەکەت سەرکەوتووت ناکات، بۆیە با هەمیشە وەڵامت بۆ ئەو کەسەبێت کە قسە لەسەر کەسایەتی تۆ دەکات، بەڵام ئەگەر هاتوو ئەو پرسیارێکی گشتی کرد، یان قسەی لەسەر ئەندامانی خێزانەکەت کرد و هەوڵی ناوزڕاندنی ئەوانیدا، ئەوا ئەوسا تۆش دەتوانی وەڵامەکەت گشتگیر بکەیت، بە وەڵامێکی لە جێ و ڕاستگۆیانە.

## چۆن وەڵامی پرسیاری ڕاگەیاندنکارەکان دەدەیتەوە؟

ڕەنگە هەمووان ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕووبەڕووی چاوی کامێرا و وەڵامی لە ناکاوی ڕاگەیاندنکارەکان بووبینەوە یان ببینەوە، یانیش بە ویستی خۆت بەشداری لە بەرنامەیەکی تەلەفیزیۆنی یان ڕادیۆیی بکەیت، بەتایبەتیش ئەگەر تۆ کەسێکی دیار و ناودار بیت، یان بازرگانێک یان هونەرمەندێک بیت، یان بەرپرسێکی دیاری حیزبێک بیت یانیش بەڕێوەبەری کۆمپانیایەک بیت، یان....، چۆن وەڵامی ئەو پرسیارانە دەدەیتەوە کە ئاڕاستەت دەکرێن؟

لەکاتێکدا ڕەنگە ئامانج لەو پرسیارانە شکاندنەوە و ئیحراجکردنی تۆ بێت، یاخود دووچارکردنت بێت بە هەڵوێستێک کە ڕەنگە زیانی بۆ خۆت و ئەو شوێن و پێگەیە هەبێت کە تۆ هەتە، بۆیە ئاگاداربوون و شارەزابوون بە چۆنیەتی وەڵامدانەوەی ئەو جۆرە پرسیارانە ڕەنگە یارمەتی دەرێکی باش بن بۆ ئەوەی بە ئاسانترین شێوە وەڵامی پرسیارەکان بدەیتەوە و دووچاری هیچ هەڵەیەک نەبیت کە ببێتە هۆی زیانگەیاندن بەخۆت بە پێگە و نازناو و شوێنی کارکردنت.

بەر لە هەموو شتێک دەبێ ئەوە بزانین هیچ کەسێک نیە سڵ لە چاوی و کامیرا و پرسیارە لەناکاوەکان نەکات، بۆیە تۆش ئەوەت لا ئاسایی بێت، بە کەم و کورتیەک و گرێیەکی دەروونی خۆتی مەزانە.

دواتر پێویستە ڕەچاوی ئەو هەنگاوانە بکەیت کە ئیستا ئاماژەیان پێدەکەین، بەدڵنیاییەوە هەر کەسێ بەگوێرەی ئەم هەنگاوانە وەلامی پرسیارەکان بداتەوە، هەم بە دوور دەبێت لە هەڵەی وەلامدانەوە، هەمیش پارێزراو دەبێت لە هەر مەوقیف و هەڵوێستێکی چاوەڕوان نەکراو و ڕووشکێن.

**هەنگاوی یەکەم:**

**تێگەیشتن لەپرسیار:** عەرەب وتویەتی: "فهم السؤال نصف الإجابة" واتە: "تێگەیشتن لە پرسیار نیوەی وەلامە"، بۆیە تێگەیشتن لە هەر پرسیارێک کە ئاراستەت دەکرێت بیکە بە هەنگاوی یەکەمت بۆ وەلامدانەوەی پرسیارەکە، چونکە لە حاڵەتی تێنەگەیشتن لە پرسیارەکە ڕەنگە وەلامێکی هەڵە بەبەرامبەر بدەیت، ئەویش ئەو هەڵەیەت بقۆزێتەوە و بیکاتە پرسیارێکی ڕووشکێنانە بۆت، یانیش دەتوانێ بە وتەیەکی گاڵتە ئامێزەوە دووچاری شەرمێکت بکاتەوە، بۆنمونە پێت بڵێ: دیارە گوێشت گران بووە! یان: تۆ کێشەی بیستنت هەیە؟

بۆیە هەرگیز ڕاستەوخۆ و ڕووکەشانە پرسیارەکان وەرمەگرە، چونکە ڕەنگە ئامانجی کەسی ڕاگەیاندنکار شتێکی جیاواز تر بێت لەوەی تۆ وەلامی دەدەیتەوە، بەلام ئەگەر تۆ بە باشی لە پرسیارەکە

گەیشتیت و لە مەبەستی پرسیارەکە تێگەیشتی ئەوا هەنگاوێکی زۆر باش و یارمەتیدەرت بڕیوە بۆ ئەوەی زۆر بە ئاسانی وەڵامی پرسیارەکە بدەیتەوە.

**هەنگاوی دووەم:**

**ئارامی و نەشڵەژان:** پرسیاری ڕاگەیاندنکاری هەر جۆرە پرسیارێک بێت پێویستە تۆ پارێزگاری لە باری دەروونی ئاسایی خۆت بکەیت و نەشڵەژێی، چونکە ڕەنگە هەر لەسەرەتاوە بیەوێ بە پرسیارێک ڕووشکێنت بکات و دووچاری هەڵوێستێکت بکات، تا دوای ئەوە بە ئارەزووی خۆی پرسیارەکانی بکات و بتخاتە ژێر حاڵەتێکی دەروونی نا ئاسایی، کە ئەمەش هەرگیز لەبەرژەوەندی تۆ بە کۆتا نایەت، بۆیە هەرگیز ئارامی خۆت لە دەست نەدەیت.
بەتایبەتیش ئەگەر لایەنگران یان دژە بۆچوونەکانی تۆ لەو بەرنامەیە ئامادەبوون کە کە تۆ بەشداریت تێیدا کردووە، چونکە هەر ئەوساتە پشتگیری ئامادەبووان لە دەست دەدەیت، کە بێگومان هەمیشە ئامادەبووان، بەتایبەتیش ئەگەر لایەنگیر بن پاڵنەرێکی بەهێزن بۆ زاڵبونت بەسەر پرسیارەکان.

**هەنگاوی سێیەم:**

**تەسلیم نەبوون بە کەسی بەرامبەر و شەرم لێ نەکردنی:** کەسی ڕاگەیاندنکار لە هەر پلە و پێگەیەک بێت، تەنانەت ئەگەر بەرپرسی خۆشت بێت، نابێت تۆ تەسلیم و ملکەچی بیت و لەبەرامبەر ئەودا خۆت بە کەم نیشان بدەیت، بەهیچ شێوەیەک بەشەرمەوە گوێ بۆ پرسیارەکانی نەگریت و لەبەرامبەریدا سەری خۆت دانەنوێنی و هیچ ئاماژەیەکی جەستەیی وا ئەنجام نەدەیت کە بەهۆیەوە وات نیشان بدات کە تۆ دڵەڕاوکێ و قەلەقی لە ئامادەبوونەکەت، یان لەوەستانت بەرامبەر بە کامیرا، بۆنمونە: تەقاندنی پەنجەکان، سەیرکردنی کاتژمێر، خوراندنی سەرت...

جگە لەم هەنگاوانە پێویستە ئاگاداری چەند خاڵێکی گرنگیش بیت، کە دەبنە یارمەتیدەرێکی باش تاوەکو بەئاسانترین شێوە بەسەر وەڵامەکاندا زاڵ بیت، لەوانەش:

- باش گوێگرتن لە پرسیارەکە تا تەواو دەبێت.
- ڕێگە نەدان بە پرسیاری دووەم، تا وەڵامی پرسیاری یەکەم نەدەیتەوە.
- فەرامۆش نەکردنی هیچ لایەنێکی پرسیارەکە.
- دووبارە کردنەوەی پرسیارەکە بە کەسی ڕاگەیاندنکار، بە تایبەتیش ئەگەر زانیت پرسیارەکە لە ناکاوە و وەڵامی خێرا و

گونجاوت ئامادە نیە، ئەمەش وات لێدەکات تا ئەو پرسیارەکە دووبارە دەکاتەوە تۆ وەڵامەکەت ئامادە بکەیت.

- داوای ڕوونکردنەوەی زیاتر لە پرسیارەکە بکە، بۆنمونە: ئەگەر پرسیارت لێکرا سەبارەت بە ژیانت، هەوڵبدە پرسیارەکە تایبەت بکە، تۆ لێی بپرسەوە: مەبەستت کام لایەنەی ژیانی منە؟

- ئەو کاتەی کە کەسی ڕاگەیاندنکار پرسیارت ئاڕاستە دەکات، تۆ هەوڵبدە سەیری ناو چاوی بکەیت، ئەمە کەسی بەرامبەر والێدەکات کە نەتوانێ بە ئاسانی ئەوەی بیەوێ ئاڕاستەت بکات.

**چۆن وەڵامی ئەو پرسیارانە دەدەیتەوە کە ڕەنگە ببنە مایەی کێشە بۆخۆت یان گروپ و حیزبەکەت یان شوێنی کارەکەت؟**

زۆر جاران کەسی ڕاگەیاندنکار ڕەنگە لە چوارچێوەی بەرنامەکەدا چەند پرسیارێکت ئاڕاستەبکات کە ببنە هۆی گرفت بۆخۆت یانیش بۆ ئەو لایەنەی کە تۆ بە نوێنەری ئەوان وەڵامی پرسیارەکان دەدەیتەوە، بۆیە پێویستە بە وریاییەوە مامەڵە لەگەڵ پرسیارەکاندا بکەیت و نەبیتە نێچیرێک بۆ ڕاگەیاندنەکان.

بۆنمونە پرسیارت لێ دەکرێت:

**- قەبارەی زیانەکانی کۆمپانیاکەتان بۆ هێندە زۆر بوو؟**

تۆ ئەگەر هەر لە سەرەتاوە هاوڕا بویت لەگەڵ کەسی ڕاگەیاندنکار لەسەری ئەوەی کە کۆمپانیاکەتان دووچاری شکست و زیانێکی زۆر بۆتەوە، ئەوا بێگومان لە پرسیاری دواتر فشارەکان لەسەرت زیاتر

دەبن و بەتەواوی دەکەویتە ژێر کاریگەری کەسی پرسیارکار، چونکە ئەو لە هۆکاری زیانەکانیش دەپرسێ کە بێگومان وەڵامی ئەو جۆرە پرسیارەش بۆ خۆت و بۆ کۆمپانیاکەش باش نابێت.

بۆیە پێویستە هەر لە سەرەتاوە بڵێی:

- لەگەڵ ڕێزم بۆت بەڵام مەبەستت کام زیانە؟

یان

- زەردەخەنەیەک، تۆ دەڵێی زۆر بوو، من لێت دەپرسم، چەند بوو؟

یان

- من زیانێک نابینم، تا تۆ پرسیاری قەبارەی زیانەکانم ئاڕاستە بکەیت، یان...

**پرسیاری کەسی (شەخصی)**

بە بۆچوونی تۆ بۆچی بەو شێوەیە بوو؟

ئەگەر زانیت بۆچوونی کەسی تۆ لێرەدا بە زیان تەواو دەبێ، با وەڵامەکەت بەم شێوەیە بێت:

- ئەمە شتێک نیە کە من بۆچۆنی تایبەتی خۆمی لەسەر بدەم، بەڵکو ئەمە پرسێکی گشتیە.

**ئەگەر وەڵامەکەت نەزانی**

بۆنمونە: کەسی ڕاگەیاندنکار دەپرسێ:

- قەبارەی بەرهەمی کۆمپانیاکەتان چەندە؟

باوەڵامەکەت بەم شێوەیە بێت:

- من نامەوێ لەبەرنامەیەکی لەو شێوەیە قەبارەی بەرهەم هێنانی کۆمپانیاکەمان باس بکەم، چونکە پرسی بەرهەم پێویستی بە وردەکاری هەیە، ڕەنگە لە مانگێک بۆ مانگێکی تر جیا بێت، تەنانەت لە ڕۆژێک بۆ ڕۆژێکی تر...

**پاشەکەوتی مانگانەت چەندە؟ شەوانە کات بەچی بەسەر دەبەیت؟**

ئەمە پرسیارێکی کەسیە و پێویستە بوار بە خۆت نەدەیت ئەم جۆرە پرسیارانە ئاڕاستەی من بکەیت.

**ئەگەر ڕاگەیاندنکار سور بوو لەسەر ئەوەی پلانی کارکردنت بزانێت، بەڵام تۆ ناتەوێ وەڵامی دروستی پێ بدەیت، چۆن وەڵامی دەدەیتەوە؟**

وا باشە بڵێیت:

- ئێستا کاتی ئەوە نیە کە شێواز و پلانی کارکردنمان بخەینەڕوو، لە کاتی خۆیدا تەواوی پلانەکە بۆ میدیاکاران دەخەینە ڕوو.

# وەڵامی پرسیار بە پرسیار

- پرسیار لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) کرا ((کەی قیامەت دادێ؟))
- پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((چیت بۆ ئامادە کردووە؟)).

وەڵامدانەوەی پرسیار بە پرسیار یەکێکە لەو هۆکار بەهێزانەی کە زۆر جاران لە هونەری وەڵامدانەوە بەکار دەهێنرێت، هەندێک جار بۆ خۆ دەرباز کردنە و هەندێک جاریش بۆ دەمکوتکردنی پرسیارکەر، جاری واش هەیە بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر و لێتێگەیشتنی زیاتر.

بۆنمونە: لە نێو کۆمەڵێک هاوڕێ دانیشتووی، تۆ باس لە زانیارییەک دەکەیت، بەڵام یەکێک لە هاوڕێکانت بەهەر هۆکارێک بێت دەیەوێ ئیحراج و ڕووشکێنت بکات لەبەردەم هاوڕێکانی ترتدا، لەبەرامبەر پێدانی زانیارییەکەت لێت دەپرسێ:

- ئایا سەرچاوەی ئەو زانیارییەت باوەڕ پێکراوە؟

تۆ ئەگەر بڵێی نازانم، ئەوا ئامانجی هاوڕێکەت پێکاوە و زانیاریەکەتی لای هاوڕێکانت کەم بایەخ کرد، لەهەمان کاتیشدا بواری قسەکردن لە دەست دەدەیت و بوارەکەت بە شێوازێکی ئۆتۆماتیکی دەدرێتە ئەو هاوڕێیەت کە پرسیارەکەی ئاڕاستەی تۆ کرد.

بەڵام ئەگەر هاتوو بە هەمان شێوەی پرسیارەکەی ئەو تۆ بە پرسیار وەڵامی بدەیتەوە ئەوا بێگومان زۆر بە ئاسانی لەو ڕووشکێنیە دەرباز دەبیت و جارێکی تر خۆت دەبیتەوە قسەکەری سەرەکی نێو دانیشتنەکە.

بۆنمونە دەتوانی بڵێیت:

من دڵنیام لە دروستی زانیارییەکە، بەڵام تۆ پێم بڵێ کام سەرچاوە لای تۆ جێگای متمانەیە؟ تۆ باوەڕ بە کام دەزگای هەواڵ دەکەیت...؟ بەوشێوەیە تۆ دەیخەیتە بەردەم چەند پرسیارێک، ئەگەر بێتوو وەڵامیشت بداتەوە، ئەو کات تۆ دەتوانی چەند خاڵێکی لاوازی ئەو دەزگایە باس بکەیت کە ئەو لای وایە باوەڕپێکراو و جێگای متمانەن.

**نمونەیەکی تر:**

لە کۆمەڵگەی ئێمەدا زۆر ئەو پرسیارە دەکرێ:

- مووچەکەت چەندە؟

تەنانەت کەسی پرسیارکەر ئەگەر ئەو پرسیارەی ئاڕاستە بکرێ بە دڵنیاییەوە لەسەر دڵی گرانە، بەڵام ڕێگە بە خۆی دەدات کە پرسیار لە هاوڕێ یان هاوسێکەی بکات.

بۆیە لەو بارەشدا وا باشە وەڵامەکەت بە پرسیار بێت، تا کەسی بەرامبەریش ئەو شعورەی بۆ بگەڕێتەوە کە پرسیارەکەی پرسیارێکی شەخسیە، بۆ نمونە بڵێ:

- پێت وایە چەند بێت؟ تەسەوڕ دەکەیت چەند بێت...؟

بەڵام ئەگەر ئەو کەسەی پرسیارەکە دەکات لە پێگەیەک دابوو کە ئارەزوو ناکەیت بەو شێوەیە وەڵامی بدەیتەوە، دەتوانی بڵێی:
- باشە الحمدلله، ژیانم دەگوزەرێنێ، گرنگ بەرەکەتە، خودا بەرەکەتداری بکات...
ئەگەر هاتوو کەسایەتیەکی گاڵتە ئامێزت هەبوو، دەتوانی پرسیارەکان بە پرسیاری گاڵتە ئامێزانە و پێکەنیناوی وەڵام بدەیتەوە، بەجۆرێک ئەگەر هاتوو پرسیارەکە بۆ ڕووشکان و ئیحراجکردنت بوو هەم خۆت دەرباز دەکەیت، هەمیش ڕەنگە کەسی پرسیارکەر بخەیتە بارێکەوە کە ببێتە جێگای پێکەنینی کەسانی تر.
بۆنمونە:
کەسێک لە سەر خوانێک کە یەکێک لە هاوڕێکانت ئامادەی کردووە، دەیەوێ وا لە تۆ بکات کە بتخاتە شەرمەوە و ئیحراجت بکات و دەست لە خواردنەکە بکێشیتەوە، دەڵێ:
- ئەرێ بەڕاست ئەوە تۆ چەند کیلۆی؟
تۆ ئەگەر بە جدی وەڵامی پرسیارەکەی بدەیتەوە و ژمارەیەکی بدەیتە دەست ڕەنگە بواری بۆ خۆشبکەیت و زیاتر بتخاتە مەوقیفەوە، بەڵام زۆر بە ئاسانی دەتوانی بە پرسیارێکی گاڵتە ئامێزەوە وەڵامی پرسیارەکەی بدەیتەوە، بۆ نمونە دەتوانی بڵێی:
- بە ورگەوە یان بێ ورگ؟ بە چەورییەوە یان بێ چەوری؟ بە....؟

## گفتوگۆی ئیبراهیم (علیه السلام) لەگەڵ باوکی و قەومەکەی*

ئیبراهیم (علیه السلام) سەبارەت بە پەرستنی بت و پەیکەرەکان ڕوو دەکات باوک و قەومەکەی و پێیان دەڵێت:

- ﴿ ...مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِيٓ أَنتُمۡ لَهَا عَٰكِفُونَ ﴾.

واتە: ((... ئەم بتانە چیە؟! ئێوە هەمیشە بەدەوریدا دێن و دەیانپەرستن؟)).

ئەوانیش وتیان:

- ﴿ ...وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ﴾.

واتە: ((...ئێمە باو و باپیرانمان بینیووە ئەمانەیان پەرستووە)).

ئینجا ئیبراهیم (علیه السلام) پێی وتن:

- ﴿ ...لَقَدۡ كُنتُمۡ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُمۡ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾.

واتە: ((... بەڕاستی ئێوە و باو و باپیرانی ئێوە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بوون)).

---

* تەواوی ئەم گفتۆگۆیەی پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه السلام) لەگەڵ باوکی وقەومەکەی لە ئایەتەکانی (٥١ تا ٧٠) سورەتی (الأنبیاء) باس کراوە.

ئەوانیش وەڵامیان دایەوە و وتیان:

- ﴿ ...أَجِئْتَنَا بِالْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ اللَّاعِبِينَ ﴾.

واتە: ((...بەڕاست، تۆ حەقیقەتت بۆ ئێمە هێناوە یان گاڵتە دەکەیت؟)).

ئیبراهیم (علیه السلام) فەرمووی:

- ﴿ ...بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الَّذِي فَطَرَهُنَّ وَأَنَا عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ ﴾.

واتە: (( -من گاڵتە ناکەم- بەڵکو دەمەوێت تێتان بگەیەنم کە پەروەردگارتان پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویە و بەدی هێناون و من لەسەر ئەو بیروباوەڕە لەشایەت و بە ئاگاکانم )).

دواتر فەرمووی:

- ﴿ وَتَاللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَامَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾ فَجَعَلَهُمْ جُذَاذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴾.

واتە: ((ئینجا ئیبراهیم لەبەر خۆیەوە سوێندی خوارد وتی: بەخوا نەخشەیەک دەکێشم و داوێک دەنێمەوە بۆ بتەکانتان دوای ئەوەی ئێوە بەجێتان هێشتن و پشتتان هەڵکرد.

ئینجا هەمووی ورد و خاش کردن جگە لە گەورەکەیان، بەڵکو کە گەڕانەوە -پرسیار بکەن- و ئیبراهیم ڕاستیان بۆ ڕوون بکاتەوە)).

کاتێک قەومەکەی گەڕانەوە و زانیان بتەکانیان شکاوە، وتیان:

- ﴿ ...مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾.

واته: ((... ئەوەی ئەمەی کردووە بە خواکانمان، بەڕاستی لە ستەمکارانە)).

هەر لە نێو خۆیاندا کۆمەڵێک وتیان:

- ﴿ ...سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ﴾.

واته: ((... بیستومانە لاوێک بە خراپە باسیان دەکات پێی دەڵێن ئیبراهیم)).

ئینجا بەشەکەی تریان فەرمانیان کرد و وتیان:

- ﴿ ...فَأْتُوا۟ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ﴾.

واته: ((... کەوابوو بیهێنن بەبەرچاوی خەڵکەوە -موحاسەبەی بکەین و لێی بکۆڵینەوە- بائەوانیش ئاگاداربن و ببینن)).

جا کە هێنایان بە ئیبراهیم (علیه السلام)یان وت:

- ﴿ ...ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴾.

واته: (((...باشە، ئەی ئیبراهیم ئایا ئەوە تۆ ئەمەت کردووە بە خواکانمان ؟)).

ئیبراهیم (علیه السلام)یش وەک گاڵتە کردنێک بە عەقڵیان فەرمووی:

- ﴿ ...بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ ﴾.

واته: ((...-بۆچی له من دەپرسن، خۆ بته گەورەکه ساغ و سەلیمه- نەخێر؛ هەر کاری ئەو بته زلەیه، ده لێیان بپرسن ئەگەر قسه دەکەن و تێ دەگەن!)).

دوای ئەو قسەی پێغەمبەر ئیبراهیم (عليه السلام)

- ﴿ فَرَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ فَقَالُوٓاْ إِنَّكُمۡ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾.

واته: ((-کەمیک داچڵەکان و- له دڵی خۆیاندا لێکیان دایەوە، سەرەنجام به خۆیان وت: بەڕاستی ئێوه هەمیشه ستەمکارن - ئیبراهیم ڕاست دەکات، ئەمانه ناتوانن بەرگری له خۆیان بکەن جۆن دەتوانن بەرگری له ئێمه بکەن-)).

پاشان بەسەرشۆڕی پاشگەزکرانەوە بۆ بیرو باوەڕە کۆنەکەیان به ئیبراهیم (عليه السلام)یان وت:

- ﴿ ...لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ﴾.

واته: ((...بێگومان تۆ زانیووته که ئەوانه قسه ناکەن و تێ ناگەن)).

ئینجا ئیبراهیم (عليه السلام) ئەوەی بەهەل زانی و بۆ دەمکوتکردنیان فەرمووی:

- ﴿ ...أَفَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا يَضُرُّكُمۡ ﴿٦٦﴾ أُفّٖ لَّكُمۡ وَلِمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾.

واتە: ((... باشە، ئاخر، چۆن شتێک دەپەرستن لە جیاتی خوا کە ناتوانێت هیچ جۆرە قازانج یان زیانێکتان پێ بگەیەنێت، -تەنانەت ئەوەتا نەیانتوانی بەرگری لە خۆشیان بکەن-

ئۆف لە دەستان و لەو شتانەش کە لەجیاتی خوا دەیپەرستن، جا ئایا ئێوە تێناگەن و بیرو هۆشتان ناخەنەکار؟)).

کاتێک ئیبراهیم (علیه السلام) ئەو قسانەی پێ وتن، هیچ قسەیەکیان بۆ نەمایەوە، جگە لەوەی کە بڵێن:

- ﴿ ...حَرِّقُوهُ وَانصُرُوٓاْ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴾.

واتە: ((ئیبراهیم بسوتێنن و پشتیوانی لە خواکانتان بکەن، ئەگەر ئێوە شتێکتان بۆ دەکرێت)).

## بامردن لە خۆیان دووربخەنەوە!

لە ئایەتی (١٦٨) سورەتی (ئالی عمران)دا خودای گەورە باسی ئەو کەسانە دەکات کە نەچوون بۆ جیهاد و لەماڵەوە مانەوە، کە پێیان وایە شتێکی باشیان کردووە و خۆیان لە مردن پاراستووە، چونکە ئەوان وتیان:

- ﴿ ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخْوَٰنِهِمْ وَقَعَدُواْ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْ ... ﴾ [آل عمران: ١٦٨].

واته: ((ئەگەر ئەوانە (واتە شەهیدەکان) بەقسەی ئێمەیان بکردایە - نەچووبان بۆ جیهاد- نە دەکوژران)).

خودای گەورەش بە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێ: ﴿...قُلْ فَادْرَءُوا عَنْ أَنفُسِكُمُ الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ [آل عمران: ١٦٨].

((ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ: دەی کەواتە مردن لە خۆتان دووربخەنەوە ئەگەر ڕاست دەکەن؟!))

## قسە لەگەڵ خودا بکە!

بە پیاوچاکێکیان وت:

- چۆن سەبرت دێت و دەتوانی ئەوەندە بە تەنیایی دابنیشی؟

- وتی: من بەتەنیا نیم، من هاونشینی خودام. ئەگەر ویستم قسەی لەگەڵدا بکەم نوێژ دەکەم، ئەگەر ویستیشم خوا قسەم لەگەڵ بکات ئەوا قورئان دەخوێنم.

## جیاوازی هیندۆس و ماستاوچی!

پرسیار لە دانایەک کرا:

- جیاوازی لە نێوان هیندۆس و ماستاوچیەکاندا چییە؟

وەڵام دایەوە و فەرمووی :

- هیندۆسەکان مرۆڤن مانگا دەپەرستن، بەڵام ماستاوچیەکان مانگان مرۆڤ دەپەرستن.

# گفتوگۆی قوتابی و مامۆستایەک

قوتابی : مامۆستا پرسیارێکم هەیە؟
مامۆستا: بەڵێ.
قوتابی: چۆن دەتوانیت فیلێک بخەیتە ناو سەلاجەیەک.
مامۆستا: نازانم.
قوتابی: زۆر ئاسانە مامۆستا، تەنها دەرگاکە دەکەیتەوە و فیلەکە دەخەیتە ناو سەلاجەکە .
پرسیارێکی ترم هەیە؟
مامۆستا: باشە بڵێ.
قوتابی: چۆن سەگێک دەخەیتە ناو سەلاجەکەوە؟ !
مامۆستا: ئاسانە، تەنها دەرگاکە دەکەیتەوە و سەگەکە دەخەیتە ناوی .
قوتابی: نەخێر مامۆستا، دەبی دەرگاکە بکەیتەوە و یەکەمجار فیلەکە دەربهێنی، ئینجا سەگەکە بخەیتە ناوی .
مامۆستا: باشە تۆ ڕاست دەکەیت .
قوتابی: باشە پرسیارێکی ترم هەیە؟ ئەگەر ڕۆژی لەدایکبوونی شێر بوو و هەموو گیاندارەکان بچن بۆ ئەوێ ئاهەنگ بگێڕن، جگە لە یەک گیاندار، مامۆستا ئەوە چ گیاندارێکە کە ناچێت؟

**مامۆستا** : بێگومان شێرەکەیە، لەبەرئەوەی شێر دڕندەیە و هەموویان دەخوات.
**قوتابی:** نەخێر مامۆستا، سەگەکەیە، لەبەر ئەوەی ئەو لەناو سەلاجەکە جێماوە .**مامۆستا:** گاڵتەم پێدەکەی؟
**قوتابی:**-نەخێر مامۆستا، بەڵام کۆتا پرسیارم هەیە؟
**مامۆستا:** فەرموو...
**قوتابی:**-ئەگەر بتەوێ لە ڕووباریکی پڕ تیمساح بپەڕیتەوە، ئەوا چی دەکەی؟
**مامۆستا:** ناتوانی هیچ بکەی، پێویستت بە کەشتییەکە تاوەکو لە تیمساحەکان دەربازت بێت.
**قوتابی:** نەخێر مامۆستا، تیمساحەکان چوونەتە ئاهەنگی لەدایکبوونی شێرەکە و بە مەلەوانی زۆر بە ئاسانی دەتوانی بپەڕیتەوە!

**"حەللاج" "ئێمە ڕۆژوومان شکاند، بەڵام دڵێکمان نەشکاند"**

ئایا ئەزانیت چیرۆکی ئەم وتەیە چییە؟
زۆر سەرنج ڕاکێشە
- نیوەڕۆیەکی مانگی ڕەمەزان "مەنصوری حەللاج" بەلای ویرانەیەکدا تێدەپەڕێ، ئەو ویرانەیە کۆمەڵێک خەڵکی تێدا نیشتەجێبوون کە نەخۆشی گەڕییان هەبوو، ئەو نەخۆشانە خەریکی خواردنی نانی نیوەڕۆ بوون، کە خواردنیان پاشماوەی نانی کەسانی تر بوو !! کەسێک لەوان "حەللاج"ی بینی پێی وت :

- فەرموو..شتێکمان لەگەڵدا بخۆن

حەللاج وتی:

- ئاخر کاتتان ناگرم؟

- کابرا :نا فەرموو.

حەللاج لەسەر خوانی نەخۆشەکان دانیشت و لەگەڵیان دەستی کرد بە نان خوارد، کابرا وتی :

- تۆ لەئێمە ناترسی؟ خەڵکی تەنانەت لێشمان نزیک نابنەوە و بەلاشماندا تێناپەڕن!!

حەللاج نەیویست تانە و ناتۆرە لەو خەڵکە بدات، وتی:

- ئاخر ئەوان بەڕۆژوون!

ئەوانیش وتیان:

- ئەی تۆ کە ئەوەندە عارف و لەخواترسی بۆ بەڕۆژوو نیت؟

- حەللاج وتی: ئەمڕۆ بەڕۆژوو نیم!

"حەللاج" چەند پاروویەک نانی خوارد و سوپاسی کردن و ئەوانی بەجێ هێشت ..کاتێک بانگی ئێوارەیدا حەللاج دەستەکانی بەرزکردەوە و وتی:

- خودایە ڕۆژووەکەم قبوڵ بکە !

یەکێک لەهاوەڵانی وتی:

- بەڵام ئێمە تۆمان بینی لەگەڵ نەخۆشەکان نانت دەخوارد؟

حەللاجیش لەوەڵامدا وتی:

ڕۆژووی من بۆ خوایە، ڕاستە من ڕۆژووم شکاند، بەڵام هیچ دڵێکم نەشکاند!

## هەموو بڕیارێک کردار نیە!!

لە یەکێ لە زانکۆکاندا مامۆستایەک پرسیارێکی لە فێرخوازەکانی کرد و وتی:

- ئەگەر چوار چۆلەکە لەسەر دارێک بن و سێ لە چۆلەکەکان بڕیار بدەن بفڕن، ئەوا چەند چۆلەکە لەسەر دارەکە ئەمێننەوە؟

هەموو فێرخوازەکان وەڵامیان دایەوە و وتیان:

- "یەک چۆلەکە"

تەنها یەک فێرخواز جیاواز لە هەموویان وەڵامی دایەوە وتی:

- "مامۆستا هەر چوار چۆلەکەکە دەمێننەوە!!"

بەشێکیان تووشی سەرسوڕمان بوون، بەشێکیشیان گاڵتەیان پێدەکرد و پێی پێدەکەنین!

- مامۆستا لێی پرسی چۆن؟

فێرخوازەکە وتی:

- تۆ وتت "بڕیار بدەن" نەک "بفڕن" بڕیاردان مانای جێبەجێکردن ناگەیەنێت!

دواتر مامۆستاکە وتی: ئائەمەیە وەڵامی درووست

ئەم چیرۆکە پوختەی ژیانی هەندێک کەسە کە لە ژیانیاندا دروشمی بریقەدار و قسەی گەورە گەورە دەکەن ، وەک ئەستێرەی ناو خەڵک و هاوڕێیانیان دەردەکەون بەڵام لە ژیانی ڕاستەقینەیاندا بەو شێوەیە

نین، زۆر قسەی بێ کردار و بڕیاری بێ ڕەفتار دەدەن، هەندێک جاریش کردارەکانیان ڕێک پێچەوانەی بڕیارەکانیانە.

## گفتوگۆی نێوان ژن و مێردێک

مێرد: نوێژی عەسرت کردووە؟

ژن: نەخێر.

مێرد: ئەی نوێژی مەغریب؟

ژن: نەخێر.

مێرد: بۆ؟

ژن: لە سەرکار زۆر هیلاک و ماندوو بووم، بۆیە تۆزێ خەوتم.

مێرد: باشە برۆ نوێژی عەسرو مەغریب بکە تا نوێژی عیشا نەبووە.

بۆ ڕۆژی دووەم پیاوەکە سەفەر دەکات، پاش گەیشتنی بۆ شوێنی مەبەست، وەک جارانی پێشوو پەیوەندی بە خێزانەکەیەوە ناکات! بەڵام ژنەکە بە بەردەوامی پەیوەندی دەکرد...

پیاوەکە وەڵام ناداتەوە!

ژنەکە، دەکەوێتە دوودڵی و گومانەوە، چونکە ئەمە یەکەم جارە پیاوەکەی بەو جۆرە وەڵامی ناداتەوەو پەیوندی پێوە نەکردووە!

دوای تێپەربونی چەند کاتژمێرێک پیاوەکە پەیوەندی دەکات و ژنە بە پەرۆشەوە وەڵام دەداتەوە و دەڵێ:

- گەیشتویت پیاوەکە؟!

پیاو : بەڵێ
ژن: کەی؟
پیاو : چوار کاتژمێر دەبێ!
ژن: ئەی بۆ پەیوەندت نەکرد؟
پیاو: هیلاک بوم کەمێ خەوتم!
ژن: بە دوو دەقە قسە کردن ئەوەنە هیلاک نەدەبوی!
ئەی گوێت لە جەرەسەکان نەبوو؟
پیاو: بەڵێ گوێم لێبوو!
ژن: کەواتە من گرنگ نیم لات بۆیە وەڵامت نەدامەوە؟
پیاو: بێگومان گرنگی بەڵام دوێنێش کاتی بانگ تۆ وەڵامی خوای گەورەت نەدایەوە! ئایا خودات بەلاوە گرنگ نەبوو؟
ژنەکە چاوی پڕ بوو لە فرمێسک و وتی: تۆ راستدەکەی، تکایە بمبورە.
پیاو: داوای لێبوردن لە من مەکە، داوای لێخۆشبوون لە خودای گەورەی بکە و ئەوە دووبارە مەکەرەوە
دڵنیابە ئەوەی کردم لە پەرۆشی و خۆشەویستیمە بۆت، من دەمەوێ لە بەهەشتیش بەیەکەوە بین.

## ئافرەت چییە؟

ئەگێڕنەوە جارێکیان کۆمەڵێک پیاو لە مەجلسی دانایەک دانیشتبون، یەکێک لە پیاوەکان دەڵێ:

- ئافرەت وەکو پێڵاو وایە کەی ویستت دەتوانی بیگۆڕی.
پیاوانی مەجلسەکە هەموان ڕوویان وەرگێڕایە لای داناکەو پێیان وت:
- تـۆ چی دەڵێی قوربان دەربارەی ئەم قسەیە؟
داناکەش بە هێمنی وتی:
- بەڵێ ڕاستە، ئافرەت پێڵاوە بۆ کەسێ کە خۆی بە پـێ هەژمار بکا.
ئافرەت تاجـە بـۆکەسێ کە خۆی بە شــا دابنێ
لەو پیاوەش گەڕێن سەرزەنشتی مەکەن، چونکە ئەو پێناسەی خــۆی بۆ ئێوە کرد.

## کێ ڕووخساری خۆی بە کراسەکەی من سڕیوە؟

ڕۆژێک پیاوێک دەیەوێ گاڵتە بە هاوڕێکەی خۆی بکات و دەچێ لە پشتی کراسەکەی وێنەی گوێ درێژێک دەکێشێ، تاوەکو لەگەل هاوڕێکانی تری بەیەکەوە گاڵتەی پێ بکەن و پێی پێبکەنن!
کاتێک هاوڕێکەی دەزانێ کەوا ئەو برادەرەی وێنەکەی کێشاوە، کراسەکەی دادەنێت و دەڵێ:
- ئەوە کام لە ئێوە ڕووخساری خۆی بە کراسەکەی من سڕیوە، وێنەکەی لەسەر کراسەکەم دەرچۆتەوە؟!

## ئایا وەزارەتی دادیشمان نیە؟

دەڵێن جارێک یەکێک لە هاوڕێکانی سەرۆکی پێشووی سۆماڵ (محمد سیاد) زۆر سووربووە لەسەر ئەوەی کە بیکات بە وەزیری نەوت لە کابینەکەی خۆیدا.

دوای ئەوەی زۆر زۆر ئەو داوایە دووبارە دەکاتەوە، سەرۆک (محمد سیاد) پێی دەڵێ:

- قەسەم بە خوا هاوڕێی خۆشەویستم حەزدەکەم بتکەم بە وەزیری نەوت، بەلام خۆ سۆماڵ نەوتی نیە، ئیتر وەزیری نەوتی بۆ چیە؟

هاوڕێکەشی دەڵێ: ((جەنابی سەرۆک، ئەی وەزیری دادیشمان نیە؟!))

## ئایا چی بکەم؟

گەنجێک لە حەکیمێکی پرسی:

- من دوو گورگ لە ناخمدا هەن و بەردەوام شەڕ دەکەن، یەکێکیان خێرەو ئەوەی تریان شەڕ، ئایا چی بکەم؟

حەکیمەکەش وەلامی دایەوە و فەرمووی:

- کامیان نان بدەی ئەویان سەردەکەوێ!

## برێخت و دادوەر

دادوەر: ناوت؟

برێخت: ئێوە خۆتان دەیزانن

دادوەر: دەیزانین ، بەلام دەبێ خۆت بیلێی

بریخت:دەی ئیوه من لەبەر ئەوە دادگایی دەکەن کە "بێرتۆلت بریختم" ئیتر بۆ دەبێ ناوەکەم بڵێم؟

دادوەر: ئاواش هەر دەبێت ناوەکەت بڵێی ، ناوت؟

برێخت: خۆ پێم وتن ، برێختم

دادوەر: هاوسەرگیریت کردووە؟

برێخت: بەڵێ

دادوەر: لەگەڵ کێ؟

برێخت: لەگەڵ خانمێکدا

(پێکەنینی ئامادەبووان)

دادوەر: تۆ دادگات بە گاڵتەجاری وەرگرتووە؟

برێخت: نەخێر وا نیە.

دادوەر: ئەی بۆ چی دەڵێیت لەگەڵ خانمێکدا هاوسەرگیریم کردووە؟

برێخت: ئاخر چونکە هەر بە ڕاستی لەگەڵ خانمێکدا هاوسەرگیریم کردووە!

دادوەر: جا کەست دیوە لەگەڵ پیاوێکدا هاوسەرگیری بکات؟

برێخت:بەڵێ

دادوەر: چ کەسێک؟

برێخت: هاوسەرەکەم ، ئەو لەگەڵ پیاوێکدا هاوسەرگیری کردووە!
(پێکەنینی ئامادە بووان).

# چەند هاورێت هەیە؟

کاتێک پاشا بەناو شاردا پیاسەی ئەکرد، گوێی لەگفتوگۆی بازرگانێک و کورەکەی بوو.

بازرگانەکە بەکورەکەی دەوت:

- کورم چەند هاورێت هەیە؟

- کورەکەش وتی: چـل هاورێم هەیە.

- بازرگانەکەش وتی: کورم من بەم تەمەنەوە تەنها هاورێ و نیوێکم هەیە،

پاشا گوێی لەم قسەیە بوو سەری سورما! لەدارو دەستەکەی پرسی یەکێک تێم بگەیەنێت، هاورێ و نیوێک یەعنی چـــی؟

- وتیان: ئەزانین هاورێیەک واتای چییە، بەڵام نیو هاورێ نازانین.

- پاشا وتی: برۆن ئەو بازرگانەم بۆ بانگ بکەن.

بازرگانەکەیان هێنایە کۆشک، پاشا لێی پرسی: پێم بڵێ هاورێ و نیوێک یەعنی چی؟

- بازرگانەکە وتی: قوربان ناتوانم بە قسە بۆت روون بکەمەوە.

- پاشا وتی: ئەی چۆن دەتوانیت؟

- بازرگانەکە وتی: قوربان بانگەواز بکە کە رۆژی هەینی بازرگانەکە (واتە من) لەسێدارە دەدرێت، چونکە تاوانێکی گەورەی ئەنجام داوە. لەرۆژی دیارکراو خەڵکێکی زۆر کۆبوونەوە و پاشاش لەوێ وەستابوو، هەموویان چاوەرێی لەسێدارەدانی بازرگانەکەبوون. پیاوێک هات و بەپاشای وت:

- گەورەم من ئامادەم نیوەی ئەو پارەیەی هەمە بیدەم، لەبەرامبەر ئازادکردنی هاوڕێکەم.
- پاشا وتی: گەر هەموو سامانەکەشت بدەیت نابێت، هاوڕێکەت تاوانێکی گەورەی ئەنجام داوە.
- پیاوەکە بەبازرگانەکەی وت: هاوڕێکەم گوێت لێ بوو، هەموو سامانەکەم بەخشی لەپێناوت بەڵام پاشا ڕازی نەبوو،ئایا بەوەفا بووم؟
- بازرگانەکەش وتی: بەڵێ، ئێستا بڕۆ، خەمی منت نەبێت.
دواتر پیاوێک بەڕاکردن هات و بەپاشای وت:
- جەنابی پاشا تۆ دەتەوێ ئەو بازرگانە لەسێدارە بدەی، تکایە ئەو بێتاوانە، من تاوان بارەکەم، ڕووی کردە خەڵکەکە و وتی:
- خەڵکینە بازرگانەکە بێتاوانە. من ئەو کارە خراپەم کردووە، من شایەنی مردنم نەک بازرگانەکە.
- پاشا وتی: زۆرباشە، کەواتە تۆ لەسێدارە دەدەین لەجێگای ئەو.
- پیاوەکە وتی : بەڵێ، لەسێدارەم بدە، من تاوانبارم.
پاسەوانەکان پەتیان کردە ملی هاوڕێی بازرگانەکە هەتا لەسێدارەی بدەن،
پاشا پێی وت:
- پەشیمان نابیتەوە؟
- پیاوەکە وتی: نەخێر، با هاوڕێکەم بگەڕێتەوە ناو ماڵ و منداڵی

پاشان بازرگانەکە بە زەردەخەنەیەکەوە بە پـاشـای وت:
- گەورەم ئێستا زانیت جیاوازی نێوان هاورێیەک و نیـو هاورێ چییە؟؟ هەرکەس بەماڵ و سامانەکەی هاورێت بوو، ئەوا نیو هاورێیە، هەرکەسیش گیانی خۆی پێبەخشیت، ئەوا یەک هاورێیە.

## بۆچی نوێژی بەیانیان پاکە؟؟

لە پیاوچاکێکیان پرسی:
- بۆچی هەوای نوێژی بەیانیان زۆر پاک و خۆشە؟!
- وتی: چوونکە هەناسەی مونافیقەکانی تێکەڵ نیە!

## ئەوکات شەڕیش ڕوونادات!!

کەسێک بە کەوانی بێ تیرەوە چوو بۆ شەڕ، بەو هیوایەی تیرێک لەلای دوژمنەوە بێت و هەڵیبگرێتەوەو بەکاری بهێنێ!
- پێیان وت: ئاخر لەوانەیە ئەو تیرە نەیەت!
- ئەویش وتی: باشتر، ئەو کات شەڕیش ڕوونادات!

## حیکمەت لەدروستکردنی مێش چییە؟

جارێکیان لە ئیمام شافعیان پرسی: حیکمەتی خوا چی بووە لە دروستکردنی مێشدا؟
شافیعی وتی: تاوەکو بێدەسەلاتی و لاوازی نیشانی ئەو کەسانە بدات کە بانگەشەی دەسەلاتداری و بەهێزی دەکەن!

# وەڵامێکی جوان

قوتابییەک دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

- جارێکیان بە مامۆستاکەم وت:

-من کتێبەکەم خوێندەوە، بەڵام هیچ شتێکی لە یادگا و زاکیرەمدا نەماوە؟

ئەویش: خورمایەکی خستە بەردەمم و پێی وتم:

-بیخۆ.

(دوای ئەوەی خواردم) لێی پرسیم:

-ئایا پێی گەورە بوویت؟

-وتم: نا.

وتی:

- بەڵام ئەو خورمایە لە جەستەتدا بەش بەش بووە و بووە بە گۆشت و ئێسقان و ڕیشاڵ و پێست و نینۆک و خانە!

ئەوسا زانیم، کاتێک کە کتێبێک دەخوێنمەوە دابەش دەبێ، زمانم پاراو و بەهێز دەکات، مەعریفەم زیاد دەکات، ڕەوشتەکانم جوان دەکات، شێوازی نوسین و قسەکردنم بەرزدەکاتەوە، ئەگەرچی هەستیشی پێ نەکەم.

## ڕێز هەر لە ڕێزدار داوا دەکرێ

ڕۆژێک شبلی کەسێکی نارد بۆ لای یەکێک لە دەوڵەمەندەکانی شار و داوای شتێکی دونیایی لێکرد، کابرای دەوڵەمەندیش پێی وت:

- داوای پێداویستی دونیاش هەر لەو کەسە بکە کە ئاخیرەتی لێ داوا دەکەیت.

شبلی وەڵامی بۆ ناردەوە و پێی وت:

- تۆ ڕەزیلیت و دونیاش هەر ڕەزیل، خودا بەڕێزە و ئەو دونیاش بەڕێز، ڕەزیل لە ڕەزیل داوا دەکەم و ڕێزیش لە ڕێزدار!

## هیچ هۆکارێک بۆ خۆشەویستی نیە

کچێک سەبارەت بە خۆشەویستی پرسیارێکی لە خۆشەویستەکەی کرد

- کچ: بۆ منت خۆش ئەوێ؟

-کوڕ: هیچ هۆکارێکم نییە بۆ خۆشەویستیت!

کچەکە حەزی بەو قسەیە نەکرد، بۆیە وتی:

- نا هۆکارێکم بدەرێ

- کور: باشە چونکە جوان و قەشەنگیت بۆیە خۆشم دەوێیت!

کچەکە زۆر دڵی خۆش بوو کە بەهۆی جوانیەکەیەوە خۆشی دەوێت، بەڵام دوای ماوەیەک کچەکە تووشی نەخۆشییەک دەبێت و ڕووخساری تێک دەچێت و جوانی و قەشەنگییەکەی نامێنێت.

ئەمجارەش هەمان پرسیاری پێشوو لە خۆشەویستەکەی دەکات و دەڵێ:

- ئایا ئێستاش هەر منت خۆش دەوێت؟

- کور: ئاخر تۆ ئێستا جوان نیت، ئایا هیچ هۆکارێک هەیە بۆ ئەوەی تۆم خۆش بووێت؟

کچەکە دەستی کرد بە گریان...کورەکە دەستی گرت و پێی وت:

- ئێستا تێگەیشتی کە هیچ هۆکارێکی بۆ خۆشەویستی نییە، بۆیە جارێکی تر لە من مەپرسە کە بۆچی منت خۆش دەوێت!

## لێرە تا لای خودا چەند پێیە

لەعارفێک دەپرسن:

- لێرەوە تا نزیکی خودا ئەندازەی چەند ڕێگایە؟

عارفەکە فەرموی:

- ئەندازەی تەنها یەک پێ!

- وتیان : چۆن ؟

- فەرمووی تەنها یەک پێ بنێ بەنەفسی خۆتدا، دەگەیتە نزیکی خودا.

## ئێمە خودامان هەیە

بە عومەری موختاریان وت:

- ئیتالیا فرۆکەی هەیە ئێمە نیمانە، ئیتر چۆن بەرنگاریان ببینەوە؟

- عومەر موختار وتی :
- ئایا فرۆکەکانیان لە سەروو عەرشی خوداوە دەفڕن یان لەخوار عەرشەوە؟
- وتیان لە خوار عەرشەوە.
- ئینجا عومەر موختار وتی:
- دەسا بزانن و دڵنیابن ئێمە ئەوەی سەرووی عەرشمان لەگەڵدایە و، ترسمان لەوانەی خوار عەرش نیە!

## من کوڕی دار فرۆشێکم!

دوای ئەوەی بیڵ گێتیس لە چێشتخانەیەک نانی خوارد، ٥ دۆلاری بەخشی بە شاگردەکە، بینی شاگردەکە سەرسامە!
- وتی: چییە بۆچی سەرسام بوویت؟
- شاگردەکە وتی: کچەکەت ماوەیەک لەمەوبەر لەسەر هەمان مێز دانیشت ٥٠٠ دۆلاری دامێ، کەچی تۆ لەگەڵ ئەوەی کە باوکی ئەوی و دەوڵەمەندترین پیاوی جیهانی تەنها ٥ دۆلارم دەدەیتێ؟!
بیڵ گێتیس زەردەخەنەیەکی کرد و وتی:
- ئەو کچی دەوڵەمەندترین پیاوی جیهانە، بەڵام من کوری دارفرۆشێکم!

## ڕزق و ڕۆزی بڕاوەتەوە

بەردەوام لەپاڕانەوەکانتدا،بڵێ :خودایە بەرەکەت بخەرە رزق و رۆزیم

یەکێک لە پیاو چاکەکان بەردەوام دوعایەکی دەکرد دەیوت:
- خودایە بەرەکەت بخەرە رزق و رۆزیم.
یەکێک لە هاوڕێکانی ڕۆژێک لێی پرسی :
- بۆچی نالێی : خودایە رزقم بدە باشتر نیە؟؟
- ئەویش لە وەڵامدا وتی :
- خودا رزق و رۆزی بۆ بەندەکانی بڕیوەتەوە، بەڵام لە خودا داواکارم بەرەکەتی بخاتە ناویەوە، چونکە بەرەکەت سەربازێکە لە سەربازە ونەکانی خودا، بۆ هەرکەسێک کە بیەوێت دەینێرێت. ئەم بەرەکەتە لە ناو ئاودا بێت زۆری دەکات، لە منداڵت دابێت ساڵحی دەکات، لە لەشت دابێت بەهێز و تەندروستی دەکات، لە دڵت دابێت بەختەوەری دەکات، لە پارە دابێت زیادی دەکات.

## دزینی ئیمان!

ڕۆژێک دزێک لە شوێنێکی قەرەباڵغ دەستی کرد بە گیرفانی پیاوێکدا وجزدانی پارەکەی دەرهێنا و دزی.
کاتێک گەیشتە ماڵەوە جزادنەکەی کردەوە، لە ناو پارەکاندا کاغەزێکی تیابوو، کە لەسەری نوسرابوو: خودایە لەبەر پیرۆزی ئەم دوعایە پارەکانم بپارێزە ( بسم الله الذي لا يضر مع اسمه شيئ فى الارض و لا فى السماء و هو السميع العليم.) پاش چەند رۆژێک دزەکە جزدانەکەی گێڕایەوە بۆ خاوەنەکەی.

هاوڕێکانی دزەکە زۆر لۆمەیان کرد لەسەر ئەو کارەی کە کردی و پێیان وت:

- ئاخر تۆ چۆن ئەو هەموو پارەیەت لە دەستی خۆت دا، بۆچی بۆ خاوەنەکەت گەڕاندەوە؟

- دزەکەش وتی: ئەو پیاوە ئیمانی بەوە هەبوو کە خوای گەورە بەهۆی ئەو دوعایەوە پارەکەی بۆ دەپارێزێت، بۆیە ئەگەر ئەو پارەیەم بۆ نەگەڕاندبایەوە، ئەوا ئیمانی بە خودا لاواز دەبوو، ئەوکات من دەبووم بە دزی ئیمان و باوەڕەکەشی، من تەنها مەبەستم دزینی ماڵی ئەو بوو، نەک دزینی ئیمان و بیر و باوەڕی!

## دەستی پاشا ببڕن!

ڕۆژێک پاشایەک لە شێتێکی پرسی:

ئایە بە ڕای تۆ حوکمی ئەو کەسە چییە کە دزی دەکات؟

- ئەوش لەوەڵامدا وتی:

- ئەگەر کەسەکە دزی بووبێت بە پیشەی، ئەوا پێویستە دەستی ببڕن، بەڵام ئەگەر لە برسان دزی کردبێت، ئەوا پێویستە دەستی پاشا ببڕن .

## ماندێلا دوو جار مامۆستاکەی دەمکوت دەکات!

کاتێک نیلسۆن ماندێلا خوێندکاری کۆلیژی یاسا بوو لە زانکۆ مامۆستایەکی سپی پێست ناوی پیتەر بوو ڕق و کینەیەکی زۆری بەرامبەر ماندێلا هەبوو .

ڕۆژێک مامۆستاکە لە چێشتخانەی زانکۆ سەرقاڵی نان خوارن بوو ماندێلاش داوای خواردنی کردو ڕۆیشت لە تەنیشت مامۆستاکەی دانیشت، مامۆستاکەی وتی:

- بەڕێز ماندێلا دیارە تۆ نازانی کە هەرگیز باڵندەو بەراز بەیەکەوە نان ناخۆن؟

ماندێلا سەیرێکی کردو بە هێمنی وتی:

- نیگەران مەبە مامۆستا من ئێستا دەفڕم و لێت دووردەکەومەوە!

مامۆستاکە بەو وەڵامەی ماندێلا زۆر تووڕە بوو چونکە ماندێلا خۆی کردە باڵندەکەو مامۆستاکەشی کردە بەراز، لەبەرئەوە بڕیاری دا لە دەرفەتێکدا تۆڵەی ئەو قسەیە لە ماندێلا بکاتەوە .

بۆ ڕۆژی دواتر مامۆستا پیتەر لەناو پۆلدا پرسیارێکی لە ماندێلا کرد و وتی:

- بەڕێز ماندێلا ئەگەر بە ڕێگایەکدا ڕۆیشتی و لە پڕ سندوقێکت دۆزیەوە لەناو سندوقەکە دوو کیسە هەبوو یەکیان پارەی تێدابوو ئەوی تریان حیکمەت و دانایی تۆ کامیان هەڵدەبژێری؟

ماندێلا بەبێ دوودڵی وتی:

- مامۆستا من کیسە پارەکە هەڵدەبژێرم!
مامۆستاکە پێکەنی و بە گاڵتەجارییەوە وتی:
- بەڵام ئەگەر من بوومایە حیکمەت و دانایيم هەڵدەبژارد.
ماندێلا وتی:
- هەموو کەسێک ئەو شتە هەڵدەبژێرێ کە نیەتی، من پارەم نیە بۆیە پارەکە هەڵدەبژێرم، دیارە تۆش دانایيت نیە بۆیە ئەو هەڵدەبژێری(بەمەش بۆ جاری دووەم ماندێلا مامۆستاکەی دەمکوت کردەوە).

## من باسی نەسەبی خۆم بۆ کردووە!!

ئافرەتێک بە هاوسەرەکەی دەڵێ:
- تۆ مێشکی کچەکەت تێکداوە، من پێم وتووە بنچینەی مرۆڤ مەیمونە، کەچی تۆ پێت وتووە لە ئادەمە.
هاوسەرەکەی وتی:
- کێشە نیە، تۆ دەربارەی نەسەبی خۆت هەواڵت پێداوە، منیش حەقی خۆمە کە دەربارەی کەسو کاری خۆم هەواڵی پێبدەم!

## بوک و خەسو

مانگی ڕەمەزان بوو، خەسو نانی ئێوارەی ئامادەکرد و سفرەی ڕازاندەوەو چاورێی بانگ بوو.

(٥) خولەک مابوو بۆبانگ، بووکەخان لەقاتی سەرەوە هاتە خوارەوە وتی:
- دایە گیان یارمەتیت ناویٚ؟
خەسووخانش وتی: وەڵا یەک ئیشم نەماوە بیکەیت، مەگەر بانگبدەیت!

## بەزمی کەرە سپی

دەگێڕنەوە کە سوڵتانی عوسمانی و هاوسەرەکەی سەردانی بەغدایان کرد، لەلایەن خەڵکەوە پێشوازییان لێکرا، دواتر لەلایەن والی بەغداو بەرپرس و سەرجەم چین وتوێژەکان بەخێرهاتنیان کرا و ڕێزی زۆریان لێنرا.
لەماوەی مانەوەیان لە بەغدا ڕۆژێکیان خانمی هاوسەری سوڵتان چاوی دەکەوێت بە کەرێکی سپی و قەڵەو توند و تۆڵ، خانم زۆری پیٚ جوان دەبیٚ، داوای لە سوڵتان کرد ئەو کەرەی بۆ بهێنن و بیباتەوە وڵاتی خۆیان.
سوڵتان: بەوالی بەغدای وت:
- ئەو کەرەمان دەویٚ بۆ هاوسەری ئازیزم جا چ بە هەدیە بێت یا بە فرۆشتن.
- والی : باشە هەر ئێستا دەچم دەیهێنم.
والی پرسیاری لە بارەی کەرەکە کرد، زانی هی ( خەلیل ترلی)یە، والی بە خەلیلی وت:

- کەرەکەتمان بە دیاری پێ بدە هاوسەری سوڵتان مەراقی لێداوە و حەزدەکات لەگەڵ خۆی بیباتەوە.
بەڵام خەلیل بەوە ڕازی نەبوو و وتی:
من کەری خۆم نادەم بەوان.
- والی: چۆن؟ واتا کەرەکەت بە دیاری پێشکەشی خانمی عوسمانی ناکەی؟ باشە نرخی چەندە؟ داوابکە پێت دەدەین.
- خەلیل: نەخێر نایفرۆشم!
- خەلیل: شەش ئەسپی جوانم هەیە بیبەن بەخۆڕایی بەڵام کەرەکەتان پێنادەم و نایفرۆشم.
- والی: بۆ؟
- خەلیل: چونکە ئەگەر کەرەکەم بدەم بەوان و ئەوانیش بیبەنەوە بۆ وڵاتی خۆیان، خەڵکەکەیان دەپرسێ ئەو کەرەتان لە کوێ بوو، ئەو کەرە هی کوێیە؟
- ئەوانیش دەڵێن ئەوە کەری بەغدایە!
ئەوسا خەڵکی وڵاتی ئەوانیش دەپرسن دیارە بەغدا بەس کەری لێبووە، بۆیە بەس کەریان هێناوە
ئەوەش بۆ سومعەی ئێمە و بەغدا ناخۆش و ناپەسەندە.
والی وەڵامی خەلیلی گەیاندە سوڵتان و ئەوانیش زۆر پێکەنین و خەلیلیان خەڵات کرد.

## ڕاسته شێتم بەڵام کەر نیم

پیاوێک سەیارەکەی لەبەردەم نەخۆشخانەیەکی دەروونی پەنچەر دەبێت، کە تایەکەی دەکاتەوە بۆ گۆڕین، بورغوەکانی لێ دەکەوێتە مەنهۆڵێکەوە و سەری لێ تێک دەچێت نازانێت چی بکات.

لەو کاتەدا کە خەریکە لە داخا دڵی بتەقێت، نەخۆشێکی دەروونی لە پەنجەرەی نەخۆشخانەکەوە هاوار دەکات و دەڵێت:

- لە هەرسێ تایەکەی تر یەکی بروغویەکیان لێ بکەرەوە و تایە سپێرەکەی پێ ببەستە، تا دەگەیتە پەنچەرچییەک!

پیاوەکە بە سەر سوڕمانەوە لە نەخۆشەکەی پرسی:

- باشە خۆ تۆ شێتیت، چۆن ئەوەت زانی؟

نەخۆشەکە دەڵێت:  کاکە گیان ڕاستە من شێتم، بەڵام خۆ کەر نیم. دواتریش بەهۆی دوو کەسی کەری وەک تۆیە من شێت بوومە.

## بێشکچی و زمانی تورکی

نوسەری گەورەی تورک و دۆستی گەلی کورد إسماعیل بێشکچی دەڵێ:

- لە یەکێک لە مزگەوتەکانی تورکیا مەلایەک لە ووتاری هەینی بەدەنگی بەرز دەیوت:

-  "وەڵاهی هەرکەسێک زمانی تورکی نەزانێ چاوی بە بەهەشت ناکەوێ"

- ناوبراو دەڵێ پیاوێکی زۆر پیریش لەو لاوە زۆر بەکوڵ دەگریا!
منیش ڕۆیشتمە لای و لێم پرسی:
- تۆ بۆ دەگریەی تۆ تورک نیت؟
ئەویش وتی بەڵێ.
- وتم دە کەوایە بۆچی دەگریەیت؟
پیاوە پیرەکە بە دەم گریانە وتی:
- "بۆخوم ناگریەم، بۆ پێغەمبەر گیان دەگریەم چونکە ئەو تورکی نەزانیوە!"

## تۆ لەحەق لاتداوە!

زانایەک چوە لای پادشایەکی ستەمکار و پێی وت:
- تۆ لە حەق لات داوە، پادشا زۆر تورە بوو، بڕیاری دا ئەم زانایە بخاتە بەندیخانەوە، پاش بەسەر بردنی حەوت ساڵ لە بەندیخانە، ڕۆژێک پادشا بیری لە قسەکانی ئەو زانایە کردەوە و فەرمانی کرد کە زاناکە بهێننە بەردەمی.
کاتێک زاناکەیان هێنا پادشا لێی پرسی:
-تۆ تورەبونێکی خراپ منت تورەکرد کاتێک بەو شێوەیە قسەت کرد .
- زاناکە: من دکتۆرم لەهەر کوێ بێت ئامۆژگاری خۆم پێشکەشی نەخۆشەکانم دەکەم.
- پادشا: کێ پێی وتی ئامۆژگاری من بکەی؟

- زاناکە: کێ پێی وتی بچیتە سەر کورسی دەسەڵات؟
- پادشا: ئەمیری وڵات.
زانا: منیش خوای بەندەکان.
- پادشا: دەزانی ئەوەی لە فەرمانی من دەرچێ بەهیلاک دەچێ؟
- زاناکە: ئەی تۆ دەزانی ئەوەی لە سنوری خودا دەربچێ دەخرێتە دۆزەخ!
پادشا: بۆچی زاناکانی تر ئەوە ناڵێن کە تۆ دەیڵێی؟
- زاناکە: چونکە ئەوان دەترسن لە حەوت ساڵی زیندانی.
من یوسف (علیه السلام) پێشەنگمە، ڕازی بوونی پەروەردگار هەڵدەبژێرم بەسەر هەڕەشە و سزای تۆ.
پادشا: دڵی نەرم بوو پێی وت:
- تۆ چیت دەوێ داوای بکە.
- زاناکە: من پیرم گەنجیم بۆ بگەڕێنەوە.
- پادشا: ناتوانم.
- زاناکە: ڕزگارم کە لە مردن.
- پادشا: ئەوە کاری من نیە.
- زاناکە: بەڵام من لەبەر دەرگای کەسێکم کە دەتوانێ هەموو ئەوانە ئەنجام بدات.
- پادشا: وتم نابێ بڕۆی هەتا شتێک داوا نەکەی.

زاناکە ئاوڕێکی دایەوە و وەک ئەوەی پادشا دروستکراوێکی لاواز بێت و پێی وت:

- داوا لە خوا نەکەم داوا لە بەندەیەکی وەک تۆ بکەم؟

- پادشا: ئەوەی تۆ دەیکەی نەزانیە.

- زاناکە: لێم تووڕەبووی چونکە وام پێ وتی؟ دەسا بزانە منیش دەترسم خودا لێم تووڕە بێت و بفەرموێ: من هەبووم و تۆ چویت داوات لە بەندەیەکی لاوازی من کرد.

- پادشا: نەجوڵێی هەتا داوای شتێکم لێنەکەیت نابێ بڕۆیت.

- زاناکە: باشە سێ کیسە ئاردم بۆ هەڵگرە و لەسەر پشتت بیهێنە بۆ ماڵەکەی ئێمە.

- پادشا: ئەگەر دەتوانی خۆت ئەوە بکە.

- زاناکە: تۆیەک کە ناتوانی سێ کیسە ئارد لەسەر پشتت هەڵبگری، چۆن دەبیتە گەورەی خەڵک و بەرپرسیارێتیان دەخەیتە سەرشانت؟ پادشا لە ئاست قسەکانی ئەو زانایە داما و هیچی بۆ وتن نەمایەوە.

## گفتوگۆی نێوان دایـک و کچێک!!

- دایک: کچم هەستە خۆت ئامادە بکە و نان بخۆ وا کاتی قوتابخانەیە.

- کچ: باشە دایکە گیان، بەڵام دایکە تۆ بۆ نوێژی بەیانی هەستایت؟

- دایک: بەڵێ کچی خۆم هەستام بۆچی دەپرسیت؟

- کچ: دایکە گیان ئەی بۆ منت خەبەر نەکردەوە؟

- دایک: ئاخر کچم تۆ تاقیکردنەوەت هەیە، وتم با تێر خەو بێت، دواتریش ئاوی گەرممان نەبوو، وتم گوناحە با هەڵی نەستێنم، ناتوانێ بەو ئاوە ساردە دەستنوێژ بگرێت.

- کچ: باشە دایکە.

- دایک: کچم ئێستا بڕۆ بۆ قوتابخانە و ئاگاداربە، بەڵێنت دابوو کە نمرەی تەواو بهێنی و یەکەمی پۆل بیت.

- کچ: باشە دایکە وا من دەڕۆم.

- کچ: دایکە گیان السلام علیکم، من هاتمەوە.

- دایک: علیکم السلام ورحمة الله وبرکاتە، کچم بەخێر بێیتەوە، دەی با بزانم چۆن بوویت لە تاقیکردنەوەکەتدا؟

- کچ: دایکە سفرم هێنا!

- دایک: چی؟! ئاخر چۆن؟ چۆن سفرت هێنا مەگەر تۆ هەموو وانەکەت بە باشی نەخوێندبوو؟

- کچ: بەڵێ دایکە گیان، دەمزانی بەڵام خۆم وەڵامم نەدایەوە و کاغەزەکەم بە سپی دایە دەستی مامۆستا!

- دایک: ڕۆڵە تۆ شێت بویت بۆ وات کرد مەگەر بەڵێنت نەدابوو پێم کە نمرەی تەواو بهێنی؟ دەزانی بەو کارەی کردت لە خوێندن دوا دەکەویت و ساڵێکت دەفەوتێ؟

- کچ: دایکە گیان من هیچ شێت نەبووم و بگرە زۆریش باشم، بەڵام تەنها ئەوەم کرد کە تۆ لەگەڵ منتدا کرد!

- دایک: کچـم بڵێ من چیم کردوە تا تۆ ئەوە بکەیت تۆ من شێت ئەکەیت؟؟

- کچ: بەڵێ دایکە من تەنها کارێکم ئەنجامدا کە تۆ پێشتر لەگەڵ منتدا ئەنجامدا، دایکە گیان پێش هەموو شتێک خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ﴾ [التحريم: ٦] واتە: ((ئەی ئەو کاسانەی کە باوەڕتان هێناوە خۆتان و کەسوکارتان بپارێزن لە ئاگرێک کە سووتەمەنیەکەی خەڵکی و بەردە، سەرپەرشتیاری ئەو دۆزەخ و ئاگرە، جۆرە فریشتەیەکن کە زۆر دڵڕەق و توندو تیژن، نافەرمانی خوا ناکەن لە هیچ شتێکدا کە فەرمانیان پێ بدات و هەرچی فەرمانێکیان پێ بدرێت ئەنجامی دەدەن)).

بەڵام تۆ منت نەپاراست، ئەوەتا تۆ منت خەبەر نەکردەوە بۆ نوێژی بەیانی، بەوەش دیدارم لەگەڵ الله لە دەست دا!

تۆ خەمت بوو بە ئاوی سارد دەستنوێژ بگرم بەڵام بیرت چوو کە ئەو بەزەیی هاتنەوەت بە مندا ڕەنگە بەرەو گەرمی دۆزەخمم ببات!

تۆ خەمت بوو کە من بە ڕاستی وەڵامی پرسیارەکانم بدەمەوە و بەو شێوەیەش ببمە یەکەمی خوێندنگاکەم، بەڵام تۆ بیرت نەهێنامەوە کە ببمە بەندەیەک کە خوا لێم ڕازی بێت و ببمە خۆشەویستی الله!

تۆ ئەو ئامانەتەت نە پاراست کە پەروەردگار لەلای تۆی داناوە، من بەڵێنم نەشکاند، بەڵکو تۆ خیانەتت لەو ئامانەتە کرد!

تۆ نیگەرانی ئەوەی کەمن پلەی بەرزی دنیا بەدەست بهێنم، بەڵام من نامەوێ پلەیەک بەدەست بێنم کە بەهۆیەوە دیداری الله لەدەست بدەم!

بەرزیی و شکۆیەکی دونیاییم ناوێ کە ڕەزامەندی پەروەردگاری تێدا نەبێ!

بەڵێ دایکە گیان، من نامەوێ دڵ تەنگ بیت بە قسەکانم، بەڵکو تەنها ویستم بیرت بخەمەوە کە نیگەرانیت بۆ دنیای من وات لێنەکات بەرەو ئاگری دۆزەخم بەریت و قیامەتم فەرامۆش بکەیت!

دایکە گیان باش بزانە من پێویستم بە خواردنی خۆش و جل و پۆشاکی گەرم نیە، بەئەندازەی ئەوە نیگەران بیت بۆ دوارۆژ و قیامەتم!

دایکە گیان بمبورە بۆ ئەوەی هەڵسوکەوتێکی نەشیاو، یان قسەیەکی نەشیاوم کردبێت، بەڵام ویستم ئاگادارت بکەمەوە لەو بەرپرسیاریەتیەی کە لەسەرتە، لەبەر دنیام قیامەتم پێ مەفەوتێنە تکایە

- دایک : کچم بەڕاستی بەوکارەی کردت بە ئاگات هێنامەوە و بیرت خستمەوە کە دەبێ چی بکەم و چۆن بم لە پەروەردە کردنتدا، خوای گەورە تۆم لێنەستێنێ و بتپارێزێ.

بمبورە ڕۆڵەکەم دڵنیابە ئەوەی کردم بەویستی خودا دووبارە نابێتەوە، خۆشم دەوێی کچی خۆم
- کچ : دایکە تۆ من ببورە منیش خۆشم دەوێی بۆیە ویستم ئاگادارت بکەمەوە، دایکە گیان بەڵێن بێت لە تاقیکردنەوەی داهاتودا باشترین نمرە بهێنم و دڵتی پێ خۆشبکەم.

## ئایا ئافرەت دەتوانێ پیاو بکات بە ملیۆنێر؟

لە (کیڤن هارت)یان پرسی:
- ئایا ئافرەت دەتوانێ پیاو بکات بە ملیۆنێر؟
- وتی: بەڵێ، ئەگەر پیاوەکە خۆی بلیۆنێر بێت!

## شەیتان چ کاری بە ماڵی وێرانە!

بە ئیبن و عەبباسیان فەرموو:
- جوولەکە دەڵێن: ئێمە لە نوێژدا وەسوەسەمان نیە.
لە وەڵامدا فەرمووی: شەیتان چ کاری بە ماڵی وێرانەیە؟!

## خودا زۆر لەوە دادپەروەترە!

ڕۆژێک سولڵتانێکی زاڵم وتار بۆ خەڵکەکەی دەدات و دەڵێت:
- ئەی خەڵکینە، ئاگاتان لێیە لەوەتەی من بوومەتە فەرمان ڕەواتان و حوکمی ئێوە دەکەم تووشی تاعون نەبوون!

کابرایەکی دەشتەکی خۆی بۆناگیرێ و لەناو خەڵکەکە هەڵدەستێتەوە و دەڵێت:
- خوای گەورە زۆر لەوە بەڕەحم و دادپەروەرترە کە لەیەک کاتدا دوو تاعونمان بۆ بنێرێت.

## دایکێک زەهایمەری هەیە!

دایکی توشی زەهایمەر بووبوو!
پێی وت :
- دایە نەخۆشیەکت هەیە، پێویستە بتبەم بۆ خانەی بەساڵاچوان!
- دایک: چ نەخۆشیەک؟
- وتی: زەهایمەر!
- دایک: زەهایمەر چیە؟
- کوڕ: واتا توشی بیرچوونەوە بویت، تۆ هەموو شتێکت لەبیردەچێتەوە!
- دایک: هەروەک ئەو نەخۆشیەی کە خۆت هەتە؟!
کوڕ: چۆن؟
- دایک: هەروەک ئەوەی کە لەبیرت کردووە، کە بە چ زەحمەتێک گەورەم کردووی! چەندە ئازارم کێشاوە تا پێگەیشتی و گەورەبوویت!
باڵام چەمیەوە تا تۆ باڵا بکەیت و ڕێک بوەستی!

- کوڕەکە لەبیرکردنەوەدا ڕۆچوو... گەڕایەوە و بەدایکی وت:
- دایکە گیان بمبوورە!
- دایک: بۆچی؟
- کوڕ: لەبەرامبەر ئەو کارە نەشیاوەی کە ویستم بەرامبەرت ئەنجامی بدەم!
- دایک: کوا تۆ چیت کردووە؟ من هیچم بیرنایەت!

**شەهید واتای چییە؟**

لە کاتی دادگایی کردنی سەید قوتبدا، یەکێک لە ئەفسەرەکان هات بۆ لای سەید و پێی وت:
- سەید وشەی شەهید واتای چییە؟

سەیدیش وەڵامی دایەوە و وتی:
- شەهید ئەو کەسەی کە شایەتی داوە، کە شەریعەتی ئیسلام بەنرخترە لە ژیانی.

**هەر لە دوای دادگایی کردنەکەی**

یەکێک لە هاوەڵانی چووە لای و لۆمەی سەیدی کرد و پێی وت:
- باشە تۆ بۆ هێندە لە دادگایی کردنەکە ڕاشکاو بوویت؟

سەید وتی:
- چونکە لە عەقیدەدا درۆکردن نییە!

**دواتر کە بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو**

شێخێکیان لە ئەزهەرەوە هێنابوو تاوەکو تەلقینی هەردوو شەهادەکە بە سەید بکات، شێخەکە وتی:

- ئەی سەید هەردوو شەهادەکەم لەگەڵ بڵێوە!
سەیدیش قسەکانی پێبڕی و وتی:
- من وا لە سەر (لا إله إلا الله) لە سێدارە دەدرێم، تۆش پارە بە (لا إله إلا الله) پەیدا دەکەیت.
پاشان سەید پێ دەکەنێ و دەڵێ: أشهد أن لا إله إلا الله، و أشهد أن محمدا رسول الله.

## ئایا لە قورئاندا باسی کەچەڵ کراوە؟

کۆمەڵە موسڵمانێک لە کۆڕی شێخێک دانیشتبوون.
شێخەکە باسی گەورەیی قورئانی دەکرد و دەیفەرموو:
لە قورئانی پیرۆزدا خودای گەورە باسی لە هەموو شتێک کردووە، جا چ بە ڕاستەوخۆ بێت، چ بە ئاماژە.
کەسێکیش کە بەمەبەستی گومان خستنە دڵی ئەو موسڵمانانە هاتبووە کۆڕەکە و لە کاتی پرسیارکردن دەرفەتی پرسیاری پێ دەدرێت.
ئەویش بۆ ئەوەی موسڵمانان لەبەرامبەر قسەکانی شێخەکە بخاتە گومان وشوبهەوە دەڵێت:
- باشە ئەی شێخ، خۆت دەبینی من کەچەڵم و هیچ قژم بەسەرەوە نیە، تۆش دەڵێی کە قورئان باسی هەموو شتێکی تێدا کراوە، ئایا قوڕئان باسی ئەو کەچەڵیەی منیشی کردووە؟

موسڵمانەکان هەموویان واقیان وڕماو و سەیری دەمی شێخیان کردبوو، ئاخۆ وەڵامی شێخ چی دەبێ:

شێخەکە زۆر بە هێمنی و بێ ئەوەی خۆی تێک بدات وتی:

بەڵێ باسی کردووە: بەڵگەش خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ... ﴾ [الأعراف: ٥٨] واتە: ((وڵاتی بەپیت و چاک و ئاوەدان، دارو درەخت و ڕووەکی تێدا دەڕوێت بەفەرمانی پەروەردگاری، ئەوەشی کە زۆنگ و پیس و بێ کەڵک بێت، شتی بێ سوود و بێ فەڕ نەبێت، هیچی لێ پەیدا نابێت...)).

پیاوە کەچەڵەکە سور هەڵگەڕا و لە شوێنی خۆی دانیشتەوە.

## داوای لێبوردن بکە!

- کوڕ: باوکە دەمەوێت هاوسەرگیری بکەم.
- باوک: داوای لێبوردن بکە.
- کوڕ: بۆچی؟
- باوک: سەرەتا داوای لێبوردن بکە.
- کوڕ: ئاخر لەبەرامبەر چی داوای لێبوردن بکەم؟
- باوک: ئەبێت داوای لێبوردن بکەیت.
- کوڕ: یەک هۆکارم پێ بڵێ تا داوای لێبوردن بکەم!
- باوک: نابێت سەرەتا داوای لێبوردن بکە.

- کوڕ: باشه باوکه داوای لێبوردن دەکەم.
- باوک: کوڕی خۆم ڕاهێنانەکەت تەواو بوو، ئێستا ئامادەیت بۆ چوونە ناو ژیانی هاوسەرگیریەوە، دوای ئەوەی کە توانیت بەبێ هیچ هۆکارێک داوای لێبووردن بکەیت.

## وەڵامی کەسێک بۆ وەسفی هاوڕێکەی

دوو هاورێ کە زۆر یەکتریان خۆشدەویست، یەکێکیان بەوەی تریان دەڵێت:

- قەسەم بەخوا هاوڕێکەم، تۆ بۆمن وەک جوانترین باغی دونیا وایت، بە بینینت دڵخۆش و کامەران دەبم.

ئەوەی تریشیان وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت:

- بێگومان تۆش ئەو ڕووبارە سازگارەی کە بەردەوام ئاودێرم دەکەیت، بەبێ تۆ نەجوانیم هەیە، نە ژیان.

## نیوەی بخوات و نیوەکەی تریش فرێبدات!

بە پێشەوا شافیعیان وت:
- ژنێک سێوێکی لەدەست دابووە، هاوسەرەکەی پێی وتووە:
- تەڵاقت بکەوێ ئەگەر بیخۆیت، ئەگەر فرێشی بدەیت، ئایا ئەو ژنە چی بکات باشە؟
پێشەواش هەر زۆر بە ئاسانی وەڵامی دانەوە و وتی:

- با نیوەی بخوات، نیوەکەی تریش فڕێ بدات.

## خۆزگە ڕۆژمێر بویتایە

پیاوێک هەبوو بەردەوام خەریکی خوێندنەوە بوو، ژنەکەشی - کەزۆر دەم شڕ بوو- بەو کارەی زۆر پەست بووبوو، ڕۆژێکیان بە توانجەوە وتی:

- خۆزگە منیش کتێب بومایە، هەر نا کەمێک سەیرت دەکردم و گرنگیت پێ دەدام.

پیاوەکەش کە زۆر لێی بێزار بووبوو، وەڵامی دایەوە و وتی:

ناوەڵا خۆزگە ڕۆژمێر (تقویم) دەبویت، تاوەکو هەموو سەرەتای ساڵێک گۆڕدرابایت.

## کومەیت و فەڕەزدەق

جارێکیان کومەیت - کە لاوێکی تازە پێگەیشتووبوو- بەلای فەڕەزدەقدا تێپەڕدەبێت لە کاتێکدا کە سەرقاڵی شیعر وتنە، کومەیتیش سەرسامی خۆی بۆ شیعرەکانی فەڕەزدەق دەردەبڕێ، فەڕەزدەقیش بە کومەیت دەڵێ:

- ئارەزووت دەکرد من باوکت بومایە؟

کومەیتیش دەڵێ:

- بۆ باوک نەخێر، چونکە باوکم زۆر باش و چاکە، بەڵام خۆزگە دایکم بایت.

فەڕەزدەق دەڵێ: هەرگیز وەڵامی لەو شێوەیەم نەدراوەتەوە.

## ئەی کێ خستیە بیرەوە؟

پیاوێک بە ژنەکەی دەڵێت:

- مەکری ئێوە یوسف پێغەمبەری خستە زیندانەوە!

ژنەکەش وەڵامی دایەوە و وتی:

- ئەی کێ خستیە زیندانەوە؟

پیاوەکە بێ دەنگ بوو و قسەی پێ نەما.

## عبدالملک و بوسەینە

جارێکیان عبدالملک بە بوسەینەی مەعشوقی جەمیل دەڵێت:

- قەسەم بەخوا ئەی بوسەینە، شتێک لە تۆدا نابینم سەرنج ڕاکیش بێت، نازانم جەمیل عاشقی کوێت بووە؟

بوسەینەش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ:

- ئەی ئەمیری باوەڕداران جەمیل بە دوو چاو سەیرم دەکات، کە ئەو چاوانە بەسەری تۆوە نین، برۆ چاوەکانی جەمیل بهێنە و سەیری منیان پێ بکە، ئەوسا دەبینی کە چەند جوانم.

## لەسەرچی براکەمت دەستگیر کردووە؟

جارێکیان هیندی کچی موهەللەب دەچێتە لای یەکێک لە خەلیفەکانی بەنی ئومەیە و پێ دەڵێت:

- ئەی خەلیفە، لەسەرچی براکەی منت دەستگیرکردووە؟

خەلیفەش دەڵێ:
- دەترسم لەوەی کە تەفرەقە و دووبەرەکی بخاتە نێو موسڵمانانەوە.
- هیندیش پێی دەڵێ: ئایا سزادان دوای تاوانە، یان پیش تاوان؟
خەلیفە قسەی پێ نامێنێ، فەرمان دەکات براکەی ئازاد بکەن.

## لە بێ کاری مەیە بۆ لای من

جارێکیان کاربەدەستێک بە ئەبو عەینای وت:
- ئەی ئەبو عەینا بەخوا زۆر سەرقالم، هەر بێ کاربم دێم بۆلات.
ئەبو عەیناش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ:
- قوربان، لە بێ کاریان مەیە بۆ لای من، ئەگەر لات گرنگم کاتێکی خۆتم بۆ تەرخان بکە.

## نەخێر تەنها پۆرتت شکاوە!

لەبەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی لە مانگی ڕەمەزان، گەنجێک پەیوەندی بە مامۆستایەکی ئایینیەوە دەکات و دەڵێت:
- مامۆستا گیان پرسیارێکی شەرعیم هەیە، مامۆستا ئەمرۆ لە بازاڕ خۆم بۆ نەگیرا و ژمارەی تەلەفونەکەم خستە بەردەمی کچێکەوە، ئایا بەو کارە ڕۆژوەکم شکاوە؟
مامۆستاش خێرا وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ:
- نەخێر تەنها پۆرتت شکاوە.

## گفتوگۆی باوەڕدارێک و بێ باوەڕێک

ئەم گفتوگۆیەی خوارەوە لە نێوان باوەڕدارێک و بێ باوەڕێک ڕوویدا:

- بێ باوەڕ: تۆ باوەڕت بە هەبوونی (الله) هەیە؟
- باوەڕدار: بەڵێ، بێگومان.
- بێ باوەڕ: ئایا بینیوتە؟
- باوەڕدار: نەخێر.
- بێ باوەڕ: گوێبیستی بوویت؟
- باوەڕدار: نەخێر.
- بێ باوەڕ: بۆنت کردووە، دەستت لێداوە؟
- باوەڕدار: بێگومان نەخێر.
- بێ باوەڕ: ئەی چۆن باوەڕ بە هەبوونی دەکەیت؟
- باوەڕدار: تۆ عەقڵت هەیە؟
- بێ باوەڕ: بەڵێ، بێگومان.
- باوەڕدار: بینیوتە؟
- بێ باوەڕ: نەخێر.
- باوەڕدار: گوێبیستی بوویت؟
- بێ باوەڕ: نەخێر.
- باوەڕدار: بۆنت کردووە، دەستت لێداوە؟
- بێ باوەڕ: بێگومان نەخێر.

- باوەڕدار: کەواتە تۆ عەقڵت نیە، ببورە من قسە لەگەڵ شێت و بێ عەقڵێکدا ناکەم.

## موسڵمان و مولحیدێک

مولحیدێک بە موسڵمانێک دەڵێت:

- باشە ئێوە بەڵگەتان چییە لەسەر ئەوەی کە خودای ئێوە باشترین ڕزق و ڕۆزی دەرە؟

موسڵمانەکەش زۆر بەهێمنی وتی:

- چونکە ئەگەر کەسێکی وەک تۆ هاوبەشیشی بۆ بڕیاربدات، ئەوا ئەو ڕزقی نابڕێت و ڕەنگە زیاتر لە پێشووتریشی پێببەخشێ.

## منیش وەک تۆ نەخوێندەوارم

ئەنیشتاین هیچ کاتێک بەبێ چاویلکەکەی نەدەچوو بۆ هیچ شوێنێ، ڕۆژێکیان دەچێتە چێشتخانەیەک، بەڵام چاویلکەکەی بیردەچێ، کاتێک گارسۆن لیستی خواردەمەنیەکان دەخاتە بەردەمی تا خواردنێک دەست نیشان بکات، ئەنیشتاین دەڵێ:

- ئەگەر ئەزیەت نیە خواردەمەنیەکانم بۆ بخوێنەوە.

گارسۆنیش نازانێ ئەوە ئەنیشتاینی زانایە و لەبەر بێ چاویلکەیی شتی پێ ناخوێندرێتەوە، وا دەزانێ نەخوێندەوارە، بۆیە دەڵێت:

- ببورە مامە، منیش وەک تۆ نەخوێندوارم.

## داربڕێک و ڕەزیلێک

دەگێڕنەوە جارێکیان کەسێکی ڕەزیل داربڕێک بە کرێ دەگرێ، تاوەکو ئەو دارانەی بۆ پارچەپارچە بکات و ئامادەی بکات بۆ زستان.

هەردووکیان لەسەر بڕە پارەیەک ڕێککەوتن، بەڵام دواتر کابرای ڕەزیل و خاوەن ماڵ کەوتە ناو خەیاڵات و بیرکردنەوە لەو بڕە پارەیەی کە دەیدات بەو داربڕە، بڕی پارەکەی پێ زۆربوو، بۆیە بڕیاریدا کە خۆی بکاتە هاوبەشی پارەکە، تاوەکو بەشێک لە پارەکەی بۆ بگەڕێتەوە.

بیرۆکەکەشی بەو شێوەیە بوو، چووە لای داربڕەکە دانیشت، هەر چەند ئەو بیور و تەورداسەکەی بەرزبکربایەوە ئەویش هاواری دەکرد و دەیوت:

- ئەک دەستەکانت خۆش، ئەک سەلامەت بی.

کاتێک داربڕەکە کارەکەی تەواو کرد، داوای کرێکەی کرد.

بەڵام کابرای ڕەزیل نیوەی ئەو بڕەی دایە کە لەسەری ڕێککەوتبوون، داربڕەکەش پرسیاری کرد و وتی:

- بەڕێزم، ئێمە لەسەر زیاتر ڕێککەوتبوین، بۆ تۆ ئەوەندە پارەم پێ دەدەیت؟

- کابرای ڕەزیل: ئەی منیش هاوکاریم نەدەکردی و لەسەر کارەکەت هانم نەدەدایت، بۆیە نیوەم بۆخۆم دانا!

دوای مشتومڕێکی زۆر چوونە لای دادوەر و بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە، حاکمیش وتی:

- هەر دووکتان پارەکان بدەنە دەستی من، دواتر حاکم بە داربڕەکەی وت:

- دەستت بکەرەوە، ئەویش دەستی کردەوە و تاک تاک دینارەکانی دەخستە دەستی کابرای داربڕ، تا هەموو دینارەکانی خستە دەستی.

کابرای ڕەزیل توڕەبوو و وتی:

- ئەی کوا مافی من جەنابی دادوەر؟

- دادوەر: کاتێک پارەکانم خستە دەستی داربڕەکە گوێبیستی دەنگی دینارەکان دەبویت؟

- کابرای ڕەزیل: بەڵێ.

- دادوەر: ئێ ئەوە مافی تۆیە، پاداشتی دەنگ، هەر دەنگە.

## کامەیان قورسترن؟

جارێکیان پێشەوا "شەوکانی" لە ناو نوێژدا عەمامەکەی دەکەوێت و ئەویش هەڵیدەگرێتەوە و دەیخاتەوە سەرسەری.

هەندێک زانای زەیدیش دەڵێن:

- چونکە عەمامەکەی قورسە بۆیە کەوتووە، بەمەش نوێژەکەی بە تاڵە.

پێشەوا شوکانیش لە وەلامیاندا دەڵێت:

- بۆ عەمامە قورسترە یان ئومامە؟ (مەبەستی پێ کچی زەینەبی کچی پێغەمبەری خودایە (ﷺ)، کە زۆرجاران لە کاتی نوێژ چۆتە سەر پشتی پێغەمبەری خودا(ﷺ)).
زانا زەیدییەکان هیچ قسەیەکیان بۆ نەمایەوە.

## ئەوە لەخۆت بپرسە

کەسێک ویستی گاڵتە بە پیرەپیاوێک بکات و سوکایەتی پێبکات، پێی وت:
- ئەرێ ڕاستە کەر لە ساڵێکدا تەنها یەک ڕۆژ گەرم دەبێتەوە؟
پیرە پیاوەکەش وەڵامی دایەوە و وتی:
- ئەوە لە خۆت بپرسە، من کەرنیم.

## خۆنەویستی چییە؟

لە دانایەکیان پرسی:
- خۆنەویستی چییە؟
وەڵامی دانەوە و وتی:
- سەیری دایکتان بکەن، لە واتای خۆنەویستی تێدەگەن.

## بۆچی خودای گەورە دەستبەجێ وەڵامی دوعاکان ناداتەوە؟

لە شێخ دکتۆر زاکیر نایکیان پرسی:

- بۆچی خودای گەورە دەستبەجێ وەڵامی دوعای بەندەکانی ناداتەوە؟

شێخ زاکیریش وتی:

- ئەگەر تۆ گلەیی ئەوە دەکەیت کە بۆچی خودای گەورە ڕاستەوخۆ وەڵامی دوعاکانت ناداتەوە، ئەوا پێویستە سوپاسی خوداش بکەیت کە دەستبەجێ لەسەر تاوانەکان سزات نادات.

## بە ئەندازەی زانستی خۆم بەرزبومەتەوە!

مامۆستایەکی ئایینی لەسەر مینبەر وەستابوو و ئامۆژگاری خەڵکەکەی دەکرد، یەکێک لە ئامادەبووانیش هەستایەوە و پرسیارێکی ئاڕاستەی مامۆستاکە کرد، مامۆستاکەش وتی: نازانم.

کابرا بە لە خۆبایی بونێکەوە وتی:

- ئەی کە وەڵامی پرسیاری لەو جۆرە نازانی بۆ چویتە سەر مینبەر؟

مامۆستاکەش پێی وت:

- من بە ئەندازەی زانستی خۆم بەرزبوومەتەوە، ئەگەر هاتباو بە ئەندازەی نەزانینم بەرزبووبامەوە، ئەوا ئێستا دەیان کیلۆ مەتر لە ئاستی زەوی بەرزدەبوومەوە.

## کامەیان ئیخلاسی زیاتر بێت

بە زانایەکیان وت:
- ئەگەر پیاوێک لە نوێژی فەرز سوژدەکەی درێژبکاتەوە، یەکێکی تریش لە نوێژی قونوت، کامەیان باشترە؟
- فەرمووی: کامەیان ئیخلاصی زیاتر بێت.

## وتم با کەس و کاری ئاگادار بکەمەوە

لە یەکێک لە وڵاتە ئەوروپیەکان، بەیانیەکی زوو گەنجێکی موسڵمان بەرەو مزگەوت دەڕوات، کاتێک نزیکی مزگەوت دەبێ دەبینێ سەگێک لە نزیک مزگەوتەکە تۆپیوە، ئەویش پەیوەندی دەکات بە فەرمانگەی شارەوانی، تاوەکو بێن لەوێ لایبدەن.
فەرمانبەری ئێشکگر پەیوەندیەکە وەڵام دەداتەوە، گەنجەکەش دەڵێ:
- بەڕێزم سەگێک لە فڵانە شوێن تۆپیوە، وتم با ئاگادارتان بکەمەوە، تاوەکو بێن و لایبدەن، تاوەکو بۆگەن نەبووە.
کابرای ئێشکگریش کاتێ دەزانێ ئەو کەسەی کە پەیوەندیەکەی کردووە موسڵمانە دەیەوێ گاڵتەی پێ بکات و دەڵێ:
- باشە ئاسانە، خۆ ئێوە لەو کارە زۆر شارەزان، دە بیبەن بۆ مزگەوتەکەتان و جوان بیشۆن و پاشان بە ئادابی خۆتان بینێژن و بیشارنەوە.

گەنجە موسڵمانەکەش کاتێ دەزانێ ئەو پیاوە توانج لە ئایینەکەی دەدات و ڕێزی خۆی ناگرێ، وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ:

- تۆ ڕاست دەکەیت، بەڵام ویستم پێش ئەوەی بینێژین خزم و کەس وکارەکەی ئاگادار بکەمەوە!

کابرا توڕە دەبێ و تەلەفونەکەی دادەخاتەوە.

## تەنها بە گۆڕینی حەرفێک خەلیفەی ڕازی کرد

دەگێڕنەوە، کە یەکێک لە خەلیفەکان کەنیزەکێکی دەبێ ناوی (خالصە)یە، (خالصە) بەرچاو و جوان نیە، بەڵام خەلیفە زۆری خۆشدەویست و ڕێزی زۆری لێدەگرت، جارێکیان ملوانکەیەکی گرانبەهای بە دیاری پێ دەبەخشێت، هەواڵی بەخشینی ئەو ملوانکەیە لە دەرەوەی کۆشک بڵاودەبێتەوە.

ڕۆژێکیان شاعیرێک دێتە کۆشکی خەلیفە و بە چەند شیعرێکی جوان ستایشی خەلیفە دەکات، دوای ئەوەی کە لە شیعرەکانی تەواو دەبێت، چاوی لەوەیە کە خەلیفە دیارییەکی باشی پێببەخشێ لەبەرامبەر ستایشە جوانەکانی، بەڵام خەلیفە هیچی پێ نادات و شاعیرەکەش بە توڕەیی لە کۆشک دەچێتە دەرەوە، هەر کە دەچێتە دەرەوە، دەچێتە ناوبازار و ئەم بەیتە شیعرە لەسەر خەلیفە دەڵێت:

لقد ضاعَ شعري على بابكم
كما ضاعَ عقدٌ على خالصة

واتە: بەڕاستی شیعرەکانم لەبەردەم دەرگای ئێوە بەفیرۆچوون، هەروەک چۆن بەخشینی ملوانکەیەک بە خالصە بە فیرۆچوو.
دوای ئەوە دەنگ و باس دەگاتەوە لای خەلیفە، خەلیفەش بانگهێشتی شاعیرەکە دەکات و پێی دەڵێ:
- بۆچی شیعری لەو جۆرە لەسەر من دەڵێی؟
ئایا ڕاستە تۆ وتووتە:

لقد ضاعَ شعري على بابكم
كما ضاعَ عقدٌ على خالصة

شاعیرەکەش دەڵێ:
- نا جەنابی خەلیفە، بە هەڵە بۆتۆیان گێڕاوەتەوە، لەترسی خەلیفە تەنها حەرفی عەینی (ضاع) دەکات بە هەمزە. دەڵێ من وتومە:

لقد ضاءَ شعري على بابكم
كما ضاءَ عقدٌ على خالصة

واتە: بەڕاستی شیعرەکانم لەبەردەم دەرگای ئێوە گەشانەوە، هەروەک چۆن ملوانکەکە لە ملی خالصە دەگەشایەوە.
کاتێک خەلیفە ئەو زیرەکییەی لەو شاعیرە بینی، پێکەنی و دیاری پێبەخشی و لێی خۆشبوو.

## گفتوگۆیەک لە نێوان ژن و مێردێکدا

ئەم گفتوگۆیە لە نێوان ژن و مێردێکدا ڕوویداوە، سەبارەت بەو سیفاتانەی کە پەیوەندی بە سروشتی هەر دوو ڕەگەزەوە هەیە، کە

لە زمانی عەرەبی ئەو سیفاتانە بەشێکیان دراونەتە پاڵ مێینە و بەشێکیش نێرینە، ئەم گفتو و گۆیەش لەو سۆنگەیەوە دروست بوو:
- پیاو: ئایا تێبینیت کردووە کە گەردوون (الكون) نێرە و لە ئێمەیە؟
- ژن: بەڵێ، تێبینیم کردوە کە بونەوەر( الكينونة ) مێیە و لە ئێمەیە.
- پیاو: ئەی نازانی کە ڕوناکی ( النور) لە ئێمەیە؟
- ژن: بەڵێ، زانیومە کە خۆر ( الشمس ) لە ئێمەیە.
- پیاو: ئەی ڕێز( الكرم )لەئێمە نییە؟
- ژن : بەڵێ، ڕێزگرتن ( الكرامة ) لە ئێمەیە.
- پیاو: لات سەیر نیە کە هۆنراوە ( الشعر) لە ئێمەیە؟
- ژن: پێم سەیرە، کە هەست و سۆزەکان ( المشاعر) لە ئێمەیە.
- پیاو : دەزانی زانست ( العلم) لە ئێمەیە؟
ژن: من دەزانم مەعریفە و زانیاری ( معرفة) لە ئێمەیە.
پیاوەکە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و چاوی سورهەڵگەڕا بە بێدەنگی سەیری ژنەکەی کرد و پاش کەمێک وتی:
- گوێم لێبوە دەڵێن: خیانەت ( الخيانة) لە ئێوەیە.
- ژن: بینیومە کە نوسیویانە غەدر ( الغدر) لە ئێوەیە.
- پیاو : بەڵام دەڵێن: فێڵ و تەڵەکە ( الخديعة ) لە ئێوەیە.
- ژن: بەڵام ژنەکان دەڵێن: کە درۆ ( الكذب ) لە ئێوەیە.
- پیاو: دڵنیایان کردووم کە گێژی ( الحماقة) لە ئێوەیە.
- ژن: منیش بۆم جێگیربووە کە گەمژەیی ( الغباء) لە ئێوەیە.
- پیاو: وا دەزانم تاوان ( الجريمة) لە ئێوەیە.

- ژن: دەنا لای من گوناه ( الإثم ) له ئێوەیه.
- پیاو: من فێربووم که دزێوی ( البشاعة ) له ئێوەیه.
- ژن: من تێگەیشتووم که ناشیرینی ( القبح ) له ئێوەیه.
- پیاوەکه تۆنی دەنگی دەگۆڕێت و کەمێک قورگی دەیگرێت، پەرداخێ ئاو هەڵدەگرێت و هەمووی به یەکجار دەخواتەوە.
ژنەکه ترسا، کاتێ بینی بەو توڕەییەوە پەرداخه ئاوەکەی بەدەست گرتووە، بۆیه زەردەخەنەیەکی بۆ پیاوەکه کرد، پیاوەکه کە ئەم زەردەخەنەی له ژنەکەی بینی کەمێ هێور بویەوە و وتی:
- لەوانەیه تۆلەسەرحەق بی چونکه سروشت ( الطبیعة )لەئێوەیه.
- ژن: دڵنیام تۆش لەسەر حەقی چونکه جوانی ( الجمال) لەئێوەیه.
- پیاو: نەخێر بەڵکو بەختەوەری ( السعادة ) لەئێوەیه.
- ژن: لەوانەیه، بەڵام خۆشەویستی ( الحب ) لەئێوەیه.
- پیاو: دان بەوەدەنێم که قوربانیدان ( التضحیة) لەئێوەیه.
- ژن: من لەوە تێگەیشتم که لێبوردەیی ( الصفح ) لەئێوەیه.
- پیاو: منیش بێگومانم که خۆشەویستی ( المحبة) لەخۆتانه.
ژن:من زۆر دڵنیام که دڵ و سەنتەری خۆشەویستی (القلب )لەخۆتانه.

**ئەو گفتو گۆیه تا مردن بەردەوام دەبێت.**

## وەلامێکی ئەحمەد دیدات

گـەنجێک بە شێخ ئەحمەد دیدات دەڵێ:

- ئافرەتان بێ عەقڵ و گەمژەن.

ئەویش لەوەلامدا پێی دەڵێ:

- بێ عەقڵی ئافرەت لەوەدایە، کـە (٩) مـانگ لەسکیدا بێ عەقڵێکی وەک تۆی هەڵگرتووە، (٢) ســاڵ لەسنگیدا خواردنی بۆت بەرهەم هێناوە، (٢٠) ســاڵ ئەشکەنجەی دیوە و هەوڵی داوە، چاوەڕێیکرد تا بێ عـەقڵکێکی وەک تۆی گەورە کرد و ئێستا قسـەی پێ بڵێی، ئێستا زانیت ئافرەتان بۆ بێ عەقڵن؟

گەنجەکە سورهەڵگەڕا و هیچ قسەیەکی تری نەکرد.

## حەجاج و منداڵێکی دە ساڵان

منداڵێک کە تەمەنی نەدەگەیشتە دە ساڵان، دەچێتە لای حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی لە کاتێکدا کە لەسەر گومەتە سەوزەکەی پاڵکەوتبوو، کە لەو کاتەدا چەند کەسێکی قەومەکەی و چەند کەسێکی دیاری عەرەبی لابوو.

منداڵەکە سەیری گومەتەکەی کرد، پاشان چاوی خۆی لەسەر لادا و بە حەجاجی وت:

- ﴿ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴾ [الشعراء: ١٢٨ - ١٣٠] واتە: ((ئایا ئێوە لە هەموو

شوێنێکی بڵندو سازگاردا کۆشک و تەلار دروست دەکەن و خۆتان سەرگەرمی کەیف و شادی دەکەن؟! ئایا بۆ ئەوە دروست کراون؟ هەر خەریکی دروستکردنی کارگە و کارخانەن و بە ئومێدی ئەوەن هەمیشە بژین و نەمرن، کاتێکیش پەلامار دەدەن، بە شێوەیەکی زۆر دڵ ڕەق و دڕندانە پەلامار دەدەن دەست دەوەشێنن)).

لەو کاتەدا کە حەجاج پاڵکەوتبوو هەستایەوە و وتی:

- من تۆ وا دەبینم کە خاوەنی عەقڵ و ژیری، ئایا تۆ قورئانی پیرۆزت لەبەرکردووە؟

- منداڵەکە: لە لەناوچونی قورئان نەترساوم تا لەبەری بکەم، خودای گەورە خۆی پارێزگاری لێدەکات، خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾ [الحجر: ٩] واتە: ((بەڕاستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووە و بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری لێ دەکەین و نایەڵین دەستی خیانەتکار هیچ جۆرە دەستێکی تێ بخات و هەموو هەوڵێک بۆ دەستکاری کردنی نەزۆکە)).

- حەجاج: ئایا قورئانت کۆکردۆتەوە؟

- منداڵەکە: بۆ قورئان بەش بەش و جیا بووە تا کۆی بکەمەوە؟ خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴾ [القيامة: ١٧] واتە: ((بەڕاستی لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوە و خوێندنەوی)).

حەجاج بەم وتانە توشی شۆک بوو، بیری کردەوە، پاشان وتی:

- ئایا قورئانت پتەو و داڕێژراو کردووە؟

- منداڵەکە: خۆی بە پتەوی و داڕێژراوی دابەزیووە: ﴿...كِتَٰبٌ أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتۡ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ خَبِيرٍ﴾ [هود: ١] واتە: ((ئەمە کتێبێکە ئایەتەکانی پتەو و داڕێژراون، پاشان ڕوون کراونەتەوە لەلایەن خوای کار دروستی زاناوە)).

لێرە هێزی وشەکان و هونەری یاریکردن بە وشەکان دیارکەوت، ئەگەرچی حەجاج کەسی لێهاتوو و دانای سەردەمی خۆی بوو، بەڵام لەبەردەم ئەو منداڵەدا لاواز و سست دەردەکەوێت، پاشان وتی:

- ئایا قورئانت سەرخستووە؟

- منداڵەکە: پەنا دەگرم بە خودای لەوەی کە من قورئان پشتگوێ بخەم.

- حەجاج: هاوار بۆ تۆ چیم وتووە؟

- منداڵەکە: هاوار بۆ تۆ بڵێ: ئایا قورئانت لەسینەدا هەڵگرتووە؟

ئەوەی لەوێ ئامادە بوو هەموویان وا گومانیان برد کە ئێستا حەجاج بڕیاری کوشتنی ئەو منداڵە دەدات، بەڵام حەجاج پرسی:

- تۆ کێیت؟

- منداڵەکە: بەندەی خودا.

- حەجاج: باوکت کێیە؟

- منداڵەکە: ئەو کەسەیە کە منی پێگەیاندووە.

- حەجاج: لەکوێ پێگەیشتووی؟

- منداڵەکە: لە شاخ.

- حەجاج: کێ تۆی ناردووە بۆ لای من؟

- منداڵەکە: عەقڵم.

- حەجاج: ئایا تۆ شێتی؟

- منداڵەکە: ئەگەر شێت بام ئەوا لە بەردەم تۆ نەدەوەستام.

- حەجاج: ئەم پێنووسەم پێ بدە.

- منداڵەکە: نەخێر ئەوە ناکەم.

- حەجاج: بۆ؟

- منداڵەکە: دەترسم شتێکی پێ بنووسیت کە تاوان بێت و دواتریش من ببم بە هاوبەشی تاوانەکەت.

- حەجاج: بەڵام من دەمەوێ فەرمان بکەم کە بڕی پەنجا هەزار درهەمت پێ بدرێت، تاوەکو بڕۆیت و جارێکی تر نەیەیتەوە بۆ ئێرە.

منداڵەکە پێکەنی.

- حەجاج: چی وایلێکردی کە پێبکەنی؟

- منداڵەکە: بە بوێرییەکەت سەرسام بووم بەرامبەر بە پەروەردگارت، خێر بەو بڕە پارەیە دەکەیت کە لە خەڵکی زەوت کردووە و بەستەم لێت سەندون؟

- حەجاج بەمە زۆر تووڕەبوو، ڕاوێژێکی بە دەوروبەری کرد و وتی: ئێوە بۆچوونتان چیە سەبارەت بەو منداڵە؟

ئەوانیش وا ئاماژەیان بۆ کرد کە پێویستە خوێنی بڕێژرێ و

بکوژری.

- ئەوسا منداڵەکە وتی: هاونشینی براکەت باشترە لە هاونشین و دانیشتوانی مەجلیسەکەی تۆ ئەی حەجاج.

- حەجاج: براکەم؟ کێ؟ وەلید؟

منداڵەکە: بەڵکو فیرعەون، چونکە کاتێک فیرعەون پرسی بە هاونشینانی مەجلیسەکەی کرد سەبارەت بە موسی (علیە السلام)، ئەوان بۆچوونیان وابوو کە فیرعەون وازی لێ بهێنێت، بەلام ئەوانەی تۆ بۆچوونیان وایە کە تۆ من بکوژی.

- پیاوێک لە قەومەکەی حەجاج هەستایەوە و وتی: بەمنی ببەخشە گەورەم.

- حەجاج: ئەوە بەخشیم بە تۆ، خودا بەرەکەتداری نەکا بۆت.

منداڵەکە دەستی کرد بە پێکەنین تا ڕووخساری سور هەڵگەڕا، پاشان وتی:

- قەسەم بەخوا، نازانم کامتان گەوجترن لە کامتان، پێبەخشین یان خۆبەخشین؟

- پیاوەکە: من ڕزگارم کردی کەچی ئاوا وەلامم دەدەیتەوە؟

- منداڵەکە: ئایا دەتوانیت سوود و زیان بۆ خۆت دەست نیشان بکەیت؟

- پیاوەکە: نەخێر.

- منداڵەکە: کەواتە چۆن دەتوانی خۆت بکەیتە خاوەنی من؟

حەجاج تا دەهات زیاتر بە وتەکانی ئەو منداڵە سەرسام دەبوو،

بۆیە وتی:

- ئەی منداڵ وافەرمان دەکەم کە سەد هەزار درهەمت پێ بدرێت، لەبەر بچوکی و ژیریشت دەتبەخشین، ئێستاش برۆ دەرەوە، جارێکی تریش لە کۆڕ و مەجلیسی خۆمدا بتبینم گەردنت دەگرم و دەتکوژم.

- منداڵەکە: من ئەو کەسە نیم تا هەڕەشە و وتە توندەکان قبوڵ نەکەم، بەڵام بەخشینەکە بە دەستی خودایە نەوەک تۆ ئەی حەجاج، خودا من و تۆ کۆنەکاتەوە، تا ئەو کاتەی موسی (علیە السلام) لەگەڵ سامری بە یەک دەگەیەنێتەوە، پاشان چووە دەرەوە و ئاوڕی لە هیچ شتێک نەدایەوە.

## ببە بە فەرمانڕەوا

یەکێک لە خەلیفەکان داوا دەکات کە بانگهێشتی زانای گەورە (ئیاسی کوڕی موعاویە)ی بۆ بکەن، کاتێک ئیاس هاتە لای خەلیفە، خەلیفە وتی:

- ئەی ئیاس من دەمەوێت کە پۆستی دادوەری بگریتە دەست.

بەڵام ئیاس ئەم داوایەی خەلیفەی ڕەت کردەوە و وتی:

- من شیاوی دادوەری نیم.

ئەم وەڵامەش بۆ خەلیفە وەڵامێکی لە ناکاو بوو، بۆیە بە توڕەیی پێی وت:

- تۆ ڕاست ناکەیت.

ئیاسیش وەڵامی دایەوە و وتی:

- خۆت بڕیارت لەسەر من دا کە من شیاو نیم.

- خەلیفە پرسیاری لێکرد و وتی چۆن؟

- ئیاس لە وەڵامدا وتی: چونکە ئەگەر من درۆزن بم وەک تۆ دەیڵێی، ئەوا من شیاوی دادوەری نیم، ئەگەر بێتو ڕاستگۆش بم ئەوا پێم وتی کە من شیاوی ئەم پۆستە نیم.

خەلیفە بێ دەنگ بوو و چیتر زۆری لە ئیاس نەکرد.

## دڵەکانمان مردوون!

کەسێک تەکسیەک ڕادەگرێت، دوای ئەوەی سەردەکەوێت دەبینێ شۆفێری تەکسیەکە کاسێتێکی قورئانی پیرۆزی خستۆتە سەر تەسجیلەکەی، هەر دوای سڵاو کردن بە شۆفێرەکە دەڵێ:

- ئەوە چییە ئەو قورئانە؟ کێ مردووە؟ (مەبەستی ئەوە بوو کە قورئان تەنها بۆ مردووانە).

کابرای شۆفێریش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ:

- قوربان دڵەکانمان مردوون.

کابرا بێ دەنگ دەبێ و تا دەگاتە جێی مەبەست هیچ ناڵێ.

## نرخی خوشکت چەندە؟

کورێک لەناو کۆمەڵێک هاوپۆلی هەڵدەستێتەوە و دەڵێ:

- کچی ئەو سەردەمە هەموویان بە دوای پارەوەن و خۆ فرۆشن.

کچێکیش هەڵدەستێتەوە و دەڵێ:

- نرخی خوشکت چەندە؟

کوڕەکە سەری خۆی داخست و زانی قسەیەکی هەڵەی کرد.

## شەرم بتانگرێ

لە یەکێک لە وڵاتەکان بەشێک لە پزیشکان و ئەندازیاران کۆ دەبنەوە و دەچنە لای سەرۆک وەزیران و پێی دەڵێن:

- جەنابی سەرۆک وەزیران، ئێمە بە ڕەوای نازانین، چۆن دەبێ موچەکەی ئێمە لە موچەی مامۆستایان کەمتر بێت!

سەرۆک وەزیرانیش وەڵامیان دەداتەوە و دەڵێ:

- شەرم بتانگرێ باسی موچەی مامۆستا دەکەن، ئایا دەتانەوێ موچەکەتان هاوشێوەی کەسانێک بێت کە ئێوەیان گەیاندووە بەو پیشەیە؟

## وەزیر و (١٠) سەگەکە

دەگێڕنەوە کە پادشایەک دە سەگی زۆر برسی کردبوو، هەر وەزیرێکیش هەڵەی کردبا ئەوا سەگەکانی لەگەڵ دەخستە زیندانەوە.

ڕۆژێکیان یەکێک لە وەزیرەکانی پادشا هەڵەیەک دەکات و پادشاش فەرمان دەکات بیخەنە بەردەمی سەگەکان.

وەزیرەکەش دەڵێ:

ئەی پادشا من (١٠) ساڵە خزمەتی جەنابت دەکەم، لەبەرامبەر ئەوە تەنها تۆ (١٠) ڕۆژ دەرفەتم بدە، دواتر چیم لێدەکەیت بیکە.

پادشا بە داواکەی ڕازی بوو.

دوای ئەوە وەزیرەکە چوو بۆ لای پاسەوانی سەگەکان و وتی:

- دەمەوێ ئەو ماوەیە من چاودێری و پاسەوانی سەگەکان بکەم.

- پاسەوانەکە: جا چ سود لەوە دەبینی؟

- وەزیرەکە: دواتر دەزانی.

وەزیر دەستی کرد بە خزمەتکردن و چاودێری کردنی سەگەکان، تا ڕۆژی خۆی هات.

پادشا فەرمانی کرد کە وەزیرەکە بخەنە زیندان و سەگەکانیشی لەگەڵ بخەنە ژوورەوە.

کاتێک دار و دەستەکەی پادشا فەرمانی پادشایان جێبەجێ کرد، هەموان توشی سەرسوڕمان بوون!

بینیان سەگەکان سەری خۆیان نەوی کردووە و لەدەوری وەزیرەکە دەسوڕێنەوە.

پادشا وتی:

- ئەوە چیت لەو سەگانە کردووە؟ بۆچی وا لە دەورت دەسوڕێنەوە؟

وەزیرەکە وتی:

- جەنابی پادشا هیچم بۆیان نەکردووە، تەنها (١٠) رۆژ خزمەتم کردوون، بەڵام ئەوان ئەو خزمەتەیان لە یاد نەچووە، کەچی (١٠) ساڵ خزمەتی تۆم کرد، لەبەرامبەر هەڵەیەکی بچوکیش بە نیازبوویت بمکەیتە خۆراکی ئەو سەگانە.

پادشا سەری لەقاند و لە وەزیر خۆشبوو.

## وەکو سەرقاڵ بوونی ئێمە بوو بە تەکنەلۆژیا

گەنجێک لە شێخێکی پرسی:

- ئەی شێخ کەمێک باسی حاڵی پێشینانم بۆ بکە لەگەڵ قورئان، واتە چۆن بە قورئانەوە خەریک بوون؟

شێخ: باسکردنی ناوێ ڕۆڵەکەم، وەکو حاڵی ئێمە بووە لەگەڵ تەکنەلۆژیای ئەو سەردەمە.

## وەڵامێکی ئیبنو تەیمیە بۆ پاسەوانی زیندان

کاتێک ئیبنو تەیمییە لە زیندان بوو یەکێک لە پاسەوانەکانی زیندان هاتە لای و پێی وت:

- لێم ببورە ئەی شێخ، من تەنها فەرمان جێبەجێ دەکەم.

ئیبنو تەیمییەش سەیرێکی کرد و وتی:

- سوێند بە خوا، بەهۆی تۆ و هاوشێوەکانی تۆ نەبوایە، نەیاندەتوانی ستەم بکەن.

## گفتوگۆی باوک و کچێک

کچێک مۆبایلی نوێی کڕیبوو، کاتێک باوکی چاوی بە مۆبایلەکە کەوت پێی وت:

- کچم کاتێک ئەو مۆبایلەت کڕی یەکەمین شت چیبوو کە کردت؟

کچەکە وتی:

- شاشەکەیم بە لەزگەیەک داپۆشی بۆ ئەوەی نەڕوشێت و نەشکێت، پاشان بەرگێکیشم بۆ کڕی.

باوکی وتی: باشە کەس ناچاری کردی تا ئەم کارە بکەی؟

کچ: نەخێر.

باوک: پێت وانیە بەم کارەت سوکایەتیت بە کۆمپانیای موبایلەکەت کردووە؟

کچ: نەخێر بە پێچەوانەوە کۆمپانیاکەش ڕێنمایی بەکارهێنەرانی دەکات، تا ئەم کارە بکەن و بەرگ و شاشە بەکاربهێنن.

باوک: ئەی لەبەر ئەوەی تەلەفۆنەکەت ناشیرین و بێ نرخ بوو ئەم کارەت کرد؟

کچ: نەخێر لەبەر ئەوە وامکرد، چونکە حەزناکەم زیانی پێبگات و لەکاتی کەوتن بشکێت و بڕوشێت.

باوک: کاتێک بەرگەکەت بۆ دانا ناشیرین بوو؟

کچ: پێم وابێت ناشیرین نەبووە ئەگەر ناشیرینیش بوبێت بەهای ئەوەی هەیە مۆبایلەکەم بپارێزم.

باوکی بە میهرەبانیەوە سەیری کچەکەی کرد و وتی :

- سا بزانە کچی خۆم باڵاپۆشی ئافرەتیش ڕێک بەو شێوەیەیە.

## برۆ بۆ دۆزەخ لەوێ موسڵمانی لێ نیە!

دوو کەسی ئەوروپی بێ باوەڕ لە فڕۆکەدا بوون، لە وواڵتێکی ئەوروپیەوە دەچوون بۆ وولاتێکی تر.

لە فڕۆکەکەدا موسڵمانێکیش لە پێشیانەوە دانیشتبوو، کاتێک کە زانیان ئەو کەسەی پێشیان موسڵمانە ویستیان گاڵتەی پێ بکەن.

یەکێکیان بەوی تری وت:

- له کاتی پشووەکەم ویستم بچم بۆ ئەفریقیا، بەڵام بۆم دەرکەوت کە نیوەی ئەفریقیا موسڵمانە، بۆیە نەچوم، ویستم لەگەڵ کۆمپانیا بچم بۆ سعودیە بۆ ئیش، بەڵام زانیم ئەویش هەمووی موسڵمانن بۆیە نەچوم بۆ ئەوێش.

برادەرەکەی لێی پرسی:

- ئەی بۆ ناچیت بۆ وولاتێکی تری ئەوروپی؟

له وەڵامدا وتی:

- ئەوروپاش پڕ بووە لە موسڵمان، نازانم ڕوو بکەمە کوێ، بیر لە هەر شوێنێ دەکەمەوە موسڵمانی لێیە.

لەو کاتەدا پیاوە موسڵمانەکە ئاوڕێکی دایەوە و بە بزەیەک سەیری کرد و وتی:

- شوێنێک هەیە هیچ موسڵمانی لێنیە، بڕۆیت بۆ ئەوێ ئیسراحەت دەکەیت.

کابرا بێ باوەڕەکەش وتی: دە پێم بڵێ کوێیە، زۆر سوپاسیشت دەکەم.

پیاوە موسڵمانەکە وتی:

بڕۆ بۆ دۆزەخ یەک موسڵمانی تێدانیە، لەوێ بۆ خۆت ئیسراحەت بکە.

## دەمکوتکردنی چەند موعتەزیلەیەک لەلایەن پێشەوا ئەحمەدەوە

(سلیمان السجزي) دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

- جارێکیان چوومە لای موعتەسەم، بینیم خەلکێکی زۆر لەوێ وەستاون، کە چوومە ژوورەوە بینیم ڕایەخێک ڕاخراوە و کورسیەکی لەسەر دانراوە، هێندەی پێ نەچوو موعتەسەم هاتوو چوو لە سەر کورسیەکە دانیشت و قاچی خستەر سەر قاچی و وتی:

- ئەحمەدی کوڕی حەنبەلم بۆ بێنن.

دوای ئەوەی هێنایان، موعتەسەم بە پێشەوا ئەحمەدی وت:

- قسە بکە کوڕی حەنبەل و هیچیش مەترسە.

پێشەوا ئەحمەدیش وتی:

- قەسەم بەخودا، ئەی موعتەسەم هاتوومە لای تۆ بێ ئەوەی بەقەد گەردێک ترس لە دڵمدا هەبێت.

- موعتەسەم: دەربارەی قورئان چی دەڵێی؟

- پێشەوا ئەحمەد: فەرمایشتی خودایە و دروستکراو نیە، خودای گەورەش دەفەرموویت: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ...﴾ [التوبة: ٦].

- موعتەسەم: ئایا بەڵگەی ترت لایە جگە لەوە؟

- پێشەوا ئەحمەد: بەڵێ، خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿ يسٓ ۝١ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ ﴾ یس: ١ - ٢ خۆ نەیفەرمووە: (يس والقرآن المخلوق).

- موعتەسەم فەرمانی کرد و وتی: بیخەنە زیندانەوە.

دواتر خەڵک بڵاوەیان کرد و منیش چوومەوە ماڵەوە، کاتێک بەیانی داهات منیش \ چوومەوە بۆ کۆشکی موعتەسەم، بەهەمان شێوە موعتەسەم لەسەر کورسی دانیشتەوە و فەرمانی کرد ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی بۆ بهێنن.

کاتێک پێشەوا ئەحمەدیان هێنا، موعتەسەم لێی پرسی:

- حاڵت چۆن بوو دوێنی شەو ئەی کوڕی حەنبەل؟

- پێشەوا ئەحمەد: سوپاس بۆ خودا زۆر باش بووم، بەڵام من یەک شتی زۆر سەیرم لە زیندانەکەی تۆدا بینی!

- موعتەسەم: چیت بینی؟

- پێشەوا ئەحمەد: نیوە شەو هەستام و دەست نوێژم هەڵگرت، دواتر دوو ڕکەعات نوێژم کرد، لە ڕکەعاتی یەکەم (الحمدلله) و (قل أعوذ برب الناس)، لە ڕکەعاتی دووەمیش (الحمدلله) و (قل أعوذ برب الفلق)م خوێند، پاشان دانیشتم و ئەتتەحیاتم خوێند و سەلامم دایەوە، پاشان هەستامەوە و تەکبیرەم کرد و (الحمدلله)م خوێند، ویستم (قل هو الله أحد) بخوینم بەڵام نەمتوانی، دواتر ویستم سورەتێکی تر بخوێنم، بەڵام هەر نەمتوانی، دواتر سەیری سوچێکی

زیندانم کرد بینیم قورئان لەوێ کەوتووە و سڕ بووە، منیش شوشتم و کفنم کرد!

- موعتەسەم: هاوار بۆتۆ کوڕی ئەحمەد، چۆن قورئان دەمرێت؟

- پێشەوا ئەحمەد: ئەی تۆ نالّێی مەخلوقە، قورئانیش ئەگەر مەخلوق بێت دەبێت بمرێت.

موعتەسەم هاواری کرد و وتی:

- ئەو ئەحمەدە شێتی کردین...شێتی کردین.

دواتر (ابن أبي دؤاد) کە کەسێکی دیاری نێو موعتەزیلەکان بوو بە موعتەسەمی وت:

- بیکوژە با نەجاتمان بێت.

موعتەسەمیش وتی:

- من بەڵێنم بە خودا داوە کە هەرگیز بە شمشێر نەیکوژم و فەرمانی کوشتنیشی نەدەم.

پاشان (ابن أبي دؤاد) وتی:

- کەواتە بە قامچی لێی بدە.

موعتەسەمیش بەقسەی کرد و بانگی چەند جەلادێکی کرد، موعتەسەم بە یەکێک لە جەلادەکانی وت:

بەچەند قامچی دەیکوژی؟

- جەلادەکە: بە (١٠) قامچی ئەی پێشەوای باوەڕداران.

(السجزي) دەڵێ:

- دواتر پێشەوا ئەحمەدیان هێنا و جلەکانیان لەبەر داکەند و دەستەکانیان توند بەیەکتریدا بەست، پاشان جەلادەکە ڕووی کردە موعتەسەم و پێی وت:

- دەست پێ بکەم ئەی پێشەوای باوەڕداران؟

- موعتەسەم وتی: قامچیەکی لێبدە.

کە قامچیەکەیان لە پێشەوا ئەحمەددا، پێشەوا وتی:

- سوپاس بۆ خودا.

قامچی دووەمی لێدرا وتی: ماشاء الله، لە هی سێیەم وتی: لاحول ولا قوة إلا بالله.

ئینجا (ابن أبي دؤاد) هاتە لای و بە پێشەوای وت:

- ئەی کوڕی حەنبەل تەنها بە چپەیەک بڵێ قورئان دروستکراوە لە دەستی خەلیفە ڕزگارت دەکەم.

پێشەواش وەڵامی دایەوە و وتی:

- تۆ بڵێ قورئان فەرمایشتی خودایە و خۆت لە ئاگری دۆزەخ ڕزگار بکە.

ئینجا لێی بێ هیوا بوون و وازیان لێ هێنا.

## چۆن کەسێکی خاکی بم؟

کەسێک بە بەکری کوڕی عەبدوڵای وت:

- چۆن ببمە کەسێکی خاکی و متواضع؟

وەڵامی دایەوە و وتی:

- ئەگەر کەسێکی لە خۆت گەورەترت بینی، ئەوا بڵێ:
لە ئیسلام بوون و کاری چاکە پێشمکەوتووە.
- ئەگەر کەسێکی لە خۆت بچوکتریشت بینی ئەوا بڵێ:
لە تاوانکردن و کاری خراپدا پێشی کەوتووم.

## دکتۆر و نەخۆشێک

نەخۆش دەچێتە ژووری دکتۆرێکەوە و سڵاو دەکات.
دکتۆریش دەڵێ:
- بەخێربێی، چۆنی؟
- نەخۆش: باشم سوپاس.
- دکتۆر: فەرموو برۆ دەرەوە با نەخۆشێکی تر بێت.

## پیاوێکی دانا و کوڕێکی دەوڵەمەند

کوڕێکی دەوڵەمەند دەچێتە لای پیاوێکی زانا بەمەبەستی گاڵتەپێکردن.
کوڕەکە بەزاناکەی وت:
- جەنابی زانا و دانا ئەو دوو شتە چین کەپڕن؟ ئەو دوو شتە چین کەبەتاڵن؟
زاناکە لەوەڵامدا وتی:
- ئەو دوو شتەی کەپڕن مێشکی من و گیرفانی تۆیە، ئەو دوو شتەی کە بەتاڵیشن گیرفانی من و مێشکی تۆیە.

کوڕە دەوڵەمەند سور هەڵگەڕا و هەستا و ڕۆیشت.

## کەواتە سوپاسی خودا بکە

د. محمدی خانی دەگێڕێتەوە:

لە ڕێگای تاراندا بینیم گەنجێک توشی پێکدادانی ئوتومبێل بووە و دابەزیوە و کفری دەکات.

- وتم: ئارام بەرەوە براکەم، تۆ ڕۆژانە چەند جار لەم ڕێگا دەچیت و دێیت؟

- وتی: هەموو ڕۆژێ دووجار.

- وتم: باشە چەند ساڵە ئەو هاتوچۆیە دەکەیت؟

- وتی: پێنج ساڵە.

- وتم: واتە تۆ لەو ماوەیە زیاتر لە (٢٠٠٠) جار بەم ڕێگایەدا ڕۆشتویت.

چەند جار توشی ڕوداوی سەخت بووی؟ چەند جار پێکدادانت لەگەڵ کەسانی بەرامبەر هەبووە؟ کەمئەندامبوویت؟ ئەسڵەن چەند جار بەهۆی پێکدادانەوە مردوویت؟!

- وتی: واللە هیچ.

- پێم وت: ئەی چەند جار لەسەر ئەو نیعمەتە سوپاسی خودات کردوە؟

سەری داخست و هیچی نەوت.

ئەوسا پێم وت: دەزانـی ڕۆژانە سەدان کەس لەبرســان دەمرن، ئایــا تۆ لەوانیت؟
دەزانیت هەزاران کەس بەهۆی پێکـــــدادانی ئوتومبێلەوە دەمرن، ئایا تۆ لەوانەیت؟
دەزانیت هەزاران کەس بەهۆی نەخۆشــی سەختەوە دەمرن، ئایا تۆ لەوانەیت؟! ئایا، ئایا...
نەخێر هیچ لەمانە نیت.
دەی کەواتە لە جیاتی کوفرانە و غەمداگرتن، سوپاسی خودابکە و دڵتەنگ مەبە.

## هەرچەند زیرەک بیت لە تۆ زیرەکتر هەیە

پیاوێک بەژنەکەی وت:
- ژنەکە بۆ ماوەی هەفتەیەک لەگەڵ فەرمانگەکەمان دەچین بۆ تورکیا، جا لەوێ بەنیازم کەمێ ڕاوە ماسی بکەم، بۆیە جل و بەرگی پێویست و سندوقی ڕاوکردنم بۆ ئامادەبکە، هەروەها بیجامە شینە حەریرەکەمت بیرنەچێت.
ژنەکە کەمێک گومانی لەپیاوەکەی کرد، بەڵام هەر چۆنێ بێت هەموو کەل و پەلەکانی بۆ ئامادەکرد.
دوای هەفتەیەک پیاوەکە گەڕایەوە، کەمێک هیلاک و ماندوو دیاربوو.

ژنەکە بەخێرهاتنی پیاوەکەی کردو لـێی پرسی:
- گەشتەکەتان چۆن بوو؟ ماسیت ڕاو کرد؟
- پیاوەکەش وتی: بەڵێ گەشتێکی خۆش بوو، ماسی زۆر و جۆراو جۆریشم ڕاوکرد.
بەڵام ژنەکە بۆچی بیجامە شینە حەریریەکەمت نەخستبووە ناو جلەکانم؟
- ژنەکەش وتی: چۆن؟ ئامادەم کردبوو، بۆم خستبوویە ناو سندوقی کەل و پەلی ڕاوە ماسیەکەت!
پیاوەکە سەری داخست و هیچی بۆ نەوترا.

## گفتو گۆیەکی کورتی نێوان سەعدی و باوکی

سەعدی شیرازی دەڵێت:
شەوێکیان لەگەل باوکم بۆ شەونوێژ هەستاینەوە، سەیری دەرەوەم کرد بینیم تەنها ماڵی ئێمە ڕووناکـە و چرای لێ داگیرساوە، وتم باوکـە:
- خۆزگە ئـەو خەڵکـەش هەڵدەستان بـۆ شـەو نوێژ، سەیرکە چـۆن هـەمویان خەوتوون و بێ ئاگان، وەکو مردوو وان و هەڵناستنەوە.
باوکم پێی وتم:
- کوڕی خـۆم، خۆزگە تۆش دەخەوتی لەجیاتی ئەوەی غەیبەتی خەڵک بکەیت.
ئەوە یەکێک لە وانە هەر گرنگەکان بوو کە فێری بووم.

## مانگ جوانترە یان دایکت؟

لە گەنجێکیان پرسی:

- کامیان جوانترە، دایکت یان مانگ؟

گەنجەکەش وتی:

- گەر دایکم دەبینم مانگم بیر دەچێتەوە، کە مانگیش دەبینم دایکم بیر دەکەوێتەوە.

## وەڵامێکی حەفصەی کچی سیرین

حەفصەی کچی سیرین تا پیریش بوو هەر دەم و چاوی خۆی دادەپۆشی، زۆر جار پێیان دەوت:

- ئەوەی بۆ وادەکەیت، خۆ بۆتۆ حەلاڵە کە دەم و چاوت دانەپۆشی، ئایەتیان بۆ دەهێناوە و دەیانوت:

- خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّتِى لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَٰتٍۭ بِزِينَةٍ ... ﴾ [النور: ٦٠] واتە: ((ئافرەتانی پیرو پەککەوتوو، ئەو ئافرەتانەی ئومێدی شوکردنیان نەماوە هیچ گوناهێکیان لەسەر نیە کە -بەشێک لە- پۆشکەکانیان لابەرن)).

ئەویش وەڵامی دەدانەوە و دەیفەرموو:

- ده ئایەتەکە تەواو بکەن کە خودا فەرموویەتی ﴿...وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ [النور: ٦٠] واتە: ((خۆ ئەگەر لاینەبەن و پۆشتە بن، ئەوا چاکترە بۆیان، خواش بیسەری زانایە)).

## ئەنوشیروان و مامۆستاکەی

دەگێڕنەوە کە لە منداڵی کیسرا ئەنو شیروان مامۆستایەکی هەبووە، ڕۆژێکیان بە بێ هیچ هۆکارێک زللەیەکی توند لە بناگوێی ئەنوشیروان دەدات! ئەنو شیروانیش زۆر ئازاری پێ دەگات.

کاتێک ئەنو شیروان گەورە بوو و دەسەڵاتی گرتە دەست و بووە خاوەن دەسەڵات، مامۆستاکەی چووە لای و پێی وت:

- پێم بڵێ، هۆکاری ئەو زللەیە چی بوو کە لە منداڵی لە بناگوێی منتدا؟

مامۆستاکەشی وتی:

- بۆ هەر بیرت ماوە؟

- ئەنو شیروان بەڵێ، چونکە بە ستەم و بەبێ هۆکار لە منتدا.

ئەوسا مامۆستاکەی وتی: دەبزانە ئەی ئەنو شیروان، ستەم بەو شێوەیەیە کە کەسی ستەم لێکراو هەرگیز لە یادی ناکات، بۆیە تا پێت دەکرێ کاری باش و چاکە ئەنجام بدە و ستەم لە کەس مەکە، منیش بۆ ئەوە ئەو زللەیەم لێتدا تا تامی زوڵم بچێژی و حاڵی مەزلومان بزانیت.

## ئایا ئێستاش تۆ هەر لە سەردەمی منداڵیدا دەژی؟

ئافرەتێکی تەمەن (٥٠)ساڵ، کە جلێکی کورت و تەنکی لەبەربوو بە لای کیژۆلەیەکی حەوت ساڵان، کە جوان خۆی داپۆشی بوو تێپەڕبوو، ئافرەتەکە ڕووی کردە دایک و باوکی کچە حەوت ساڵانەکە و پێی وتن:

- ئەوە بۆ وا داتان پۆشیوە؟ بۆ ناهێڵن تام لە ساڵانی منداڵی خۆی بکات، جلی تەنک و کورتی لەبەر بکەن تا چێژ لەسەردەمی منداڵی وەربگرێت، کاتێک گەورەبوو با ئەو جلانە بپۆشێ.

پێش ئەوەی دایک و باوکەکە هیچ وەڵامێکی ئافرەتەکە بدەنەوە، کچە حەوت ساڵانەکە بەدەنگ هاتوو وتی:

- ئایا پوریێ تۆ تا ئێستاش لە سەردەمی منداڵیتدا دەژی؟

ئافرەتەکە سور هەڵگەڕا و سەری داخست و ڕۆیشت.

## پێشەوا حەنیفە لەگەڵ ئەبو جەعفەری مەنسور

ئەبو جەعفەری مەنسور وەزیرێکی هەبوو، زۆر داخ لە دڵ بوو بەرامبەر ئەبوو حەنیفە، ڕۆژێک لە مەجلیسێکدا کە ئەبو جەعفەریش ئامادەبوو ویستی ئەبو حەنیفە توشی مەوقیف و شەرمەزاری بکات. ڕووی کردە پێشەوا حەنیفە و وتی:

- ئەی ئیمام ئەگەر خەلیفە کەسێک بە ستەم بکوژێت، ئایا خەلیفە دادپەروەرە یان زاڵم و ستەمکار؟

هەموان چاوەڕوانی وەڵامی ئەبوو حەنیفە بوون، چونکە کاتەکەی بۆ ئەو زۆر هەستیار بوو، پێشەوا حەنیفە بێ ئەوەی هیچ خۆی بشلەژێنێ، وەک هەمیشە بە لێزانی و زمانزانی خۆی وتی:

- من دڵنیام خەلیفە هەرگیز کاری واناکات، بۆیە پرسیاری لەو جۆرە بۆ کەسایەتی خەلیفە نەشیاو و نەگونجاوە.

هەموان بەو وەڵامەی سەرسام بوون، وەزیرەکەش ڕەنگی سور هەڵگەڕا و سەری خۆی داخست.

## میرزا غولام و مەولەوی

دکتۆر عبدالواحید محمد لە وتارێکی دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

- لە زانکۆی دیبۆندا، لە کۆلێژی شەریعە لە وڵاتی هندستان، ڕاگری (عمید) ئەو زانکۆیە ناوی(محمود حسن) بوو، هەر لەو زانکۆیەدا قوتابیەک هەبوو زۆر بزێوو ورياو زیرەک بوو، ناوی (مەولەوی)بوو، ئەم قوتابیە لەکاتی وانەخوێندندا زۆر مناقشە و گفتوگۆی لەگەڵ مامۆستاکاندا دەکرد، دوای تەواو کردنی کۆلێژ، ئەو زانکۆیە ئامادە نەبوو بڕوانامەی دەرچوون بە مەولەوی بدەن، چونکە لەو باوەڕەدا بوون کە مەولەوی بڕوانامە وەربگرێت و ببێت بە مەلا و بچێتە سەر مینبەر ئابڕویان دەبات.

لەو سەردەمەدا کابرایەک پەیدا بوو بەناوی (میرزا غولام قادیانەیی)، سەرەتا خۆی بە پیاوێکی موسوڵمانی بانگخواز پیشاندا و هاتە مەیدان، پاش ماوەیەک بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ئەو (محمدی

مهدی)ە، کۆمەڵێک خەڵک شوێنی کەوتن و باوەڕیان پێی کرد، دوای ماوەیەک وتی:

- من پێغەمبەر(عیسا)م، لە ئاسمان هاتومەتە خوارەوە، شوێنکەوتوانیشی باوەڕیان پێکرد و بەڕاستیان دادەنا، دوای ماوەیەکی تر وتی:

- من پێغەمبەرێکم لەدوای پێغەمبەر محمد، نێردراوی خوام، هەندێک خەڵک هەڵسان وەڵامیان دایەوەو گوتیان تۆ پێغەمبەر نیت، چونکە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرموێت : ((أنا خاتم النبی)) واتە: ((من کۆتا پێغەمبەرم)).

میرزا غولام لەسەر قسەی خۆی سوور بوو، دەشیوت: ئامادەم گفتوگۆ و مناقشە لەگەڵ هەر کەسێکدا بکەم کە بیەوێ، ناردیان بەدوای ڕاگری کۆلێژ موفتی (محمود حسن) تا وەڵامی میرزا غولام بداتەوە، ڕۆژێکیان دیاریکرد و کاتی گفتوگۆیەکە هات، لە گۆڕپانێکی گەورە خەڵکێکی زۆریان کۆکردەوە، میرزا غولام و محمود حسن هەر یەکەیان بەسواری فیلێکەوە هاتن بۆ گۆڕەپانەکە، مناقەشەکە دەستی پێکرد، موسوڵمانان و قادیانیەکان واتا شوێنکەوتوانی میرزا غولام ئامادەی گفتوگۆیەکە بوون.

سەرەتا موفتی محمود حسن دەستی پێکرد، فەرمووی:

- هیچ پێغەمبەرێک لەدوای پێغەمبەر محمد (ﷺ) نایەت، چونکە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرموێت: ((أنا خاتم النبيين)) واتە: ((من کۆتای پێغەمبەرانم)) میرزا غولامیش لە وەڵامی ئەو قسەیە وتی:

- نەخێر (خاتم) بەمانای ئەنگوستیلە دێت، واتا من ئەنگوستیلە و جوانی پێغەمبەرانم نەک کۆتای پێغەمبەرانم.

موفتی وتی: نەخێر بەمانای ئەنگوستیلە نایەت بەڵکو بەمانای کۆتایی دێت و ماناکەی زۆر ڕوون و ئاشکرایە. میرزا غولام وتی:

- ئەم فەرموودەیە کێ ڕیوایەتی کردووە؟ موفتی وتی: (عائیشە)ی دایکی ئیمانداران ڕیوایەتی کردووە.

میرزا غولام زۆر بەبێ ئەدەبی و بێ شەرمانە وتی:

عائیشە ئافرەتێکە و یەک کەسە و فەرموودەی لێ وەرناگیرێت.

دواتر وتی: جگە لە عائیشە کەسێکی تر بێنە ئەو فەرموودەیەی گێڕابێتەوە، تا ئێمەش باوەڕ بکەین، قسەکەی دایەوە بەڕووی موفتی (محمود حسن) ئەویش وەڵامی پێ نەبوو، گفتوگۆیەکە کۆتایی هات و خەڵک بڵاوەیان کردوو و چوونەوە.

زانکۆی (دیبۆند) سەبارەت بەو بابەتە کۆبونەوەیەکی سازکرد، کە ئایا چی بکەین و چۆن ئەو کێشەیە چارەسەر بکەن و کێ بدۆزنەوە تا ڕووبەڕووی میرزا غولامی بکەنەوە، یەکێک لە ئامادەبوانی کۆبونەوەکە وتی:

- با بچین بەدوای قوتابیە زیرەکەکە (مەولەوی)، ئەو قوتابیەی ڕووبەڕووی هەموو مامۆستاکان دەبویەوە و وەڵامی بەهێزی پێ بوو.

ئەوانیش ناردیان بەدوایی دا و پێیان وت:

ئەی مەولەوی بۆ ئەوە هاتووین بۆلات تا گفتوگۆ لەگەڵ میرزا غولام بکەیت، ئامادەیت؟ مەولەویش وتی:

- ئامادەم بەڵام مەرجێکم هەیە. وتیان: مەرجەکەت چییە؟ وتی بڕوانامەکەم پێ بدەن. وتیان: بەچاوان، ئەوەش بڕوانامە. وەکو جاری پێشوو کات و شوێنی موناقەشە دانرا.

خەریک بوو بەڕێکەون بۆ شوێنەکە، فیلێکیان هێنا عمید و دکتۆرەکانی زانکۆ ویستیان سواری سەرپشتی فیلە بن، مەولەوی وتی: قوربان کێ گفتوگۆیەکە دەکات پێویستە ئەو سواری فیلەکە بێت، ئەوانی داگرت و خۆی سوار بوو، عەمید و دکتۆر و مامۆستاکانی زانکۆش بەدواوەیە بوون و هانیان دەدا. کە گەیشتنە شوێنەکە و گفتوگۆیەکە دەستی پێکرد، (میرزا غولام) بە (مەولەوی) وت:

- تۆ بەڵگەت چیە کە (محمد) پێغەمبەری ئاخر زەمانەو پێغەمبەری تر بەدوای ئەوا نایەت، (مەولەوی) وتی:

- فەرموودەکەی دایکمان عائیشە کە بۆمان دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرموێت: ((أنا خاتم النبيين))، میرزا غولام وتی:

عائیشه ئافرەتێکه و بەتەنها قسەی لێوەرناگیرێت.
مەولەوی وەڵامی دایەوە و وتی: قوربان ئیجازە هەیە لەبەردەمتا قسەیەک بەڕاشکاوی بکەم؟ میرزا غولام وتی:
- فەرموو.
مەولەویش پێی وت: جەنابت (زۆڵی) واته کوڕی دایکی خۆت نیت!
میرزا وتی: بەمن دەڵێی زۆڵ، سوکایەتیم پێ دەکەیت؟
مەولەوی وتی:
- شاهیدێکم بۆ بێنه و بیسەلمێنه که تۆ زۆڵ نیت!
ئەویش وتی: دایکم.
مەولەوی وتی دایکت ئافرەتێکه و شایەدی لێوەرناگیرێت!
میرزا غولام یەکسەر بێ دەنگ بوو وسەری شۆڕکرد، (فبهت الذی کفر).
خودای گەورە فەزح و ناشرینی کرد و لەولاشەوە دەنگی تەکبیری(الله أکبر)ی موسوڵمانان بەرزبویەوە و مەولەوی سەرکەوت، دواتر مەولەوی ڕووی لە میرزا کرد و وتی: من دەڵێم دایکمان عائیشە وای فەرمووە، تۆ دەڵێی قسەی لێ وەرناگیرێت، ئێستا پێم بڵێ قسە لەدایکی تۆ وەرگرم یان نا؟
میرزا نوقەی لێوە نەهات و گۆڕەپانی مناقەشەکەی چۆڵکرد.

## وەڵامێکی دەمکوتکەری مەلای گەورەی کۆیە

مامۆستا فاتیح شارستێنی لە وتارێکیدا بەسەرهاتێکی مەلای گەورەی کۆیە دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

کەسێک دێتە لای مەلای گەورەی کۆیە، بەحسابی خۆی ڕەخنەی لە قورئانی پیرۆز دەگرێت و بەسوکایەتیەوە بە ماموستا دەڵێ:

- ئەرێ مامۆستا ئەوە بۆ لە قورئاندا هەندێ وشە و ئایەت زۆر دووبارە بوونەتەوە، بۆ نمونە ئایەتی (فبأي آلاء ربکما تکذبان) (٣١) جار لە سورەتی (الرحمن) دووبارە بۆتەوە، پێویستی بەو هەموو دووبارە کردنەوەیە نەدەکرد، تەنها جارێک باس کرابوایە ئیتر بەس بوو.

مامۆستا مەلای گەورەی کۆیەش پێی دەڵێت:

- جەنابت چ کارەی؟

- کابرا دەڵێ: کەرێکم هەیە ڕۆژانە دەچمە ئەو شاخە، بارە داری پێ دەهێنم لەبازاڕدا دەیفرۆشم.

مامۆستا پێی دەڵێ:

- هەتا دەچی و دێیەوە چەند جار بە کەرەکەت دەڵێی هۆش، هۆش و هەچە، هەچە؟

- ئەویش دەڵێ: وەڵا زۆر، ڕەنگە بەدەیان جار و بگرە سەدان جار ئەو وشەیە دووبارە بکەمەوە.

مەلای گەورەش پێ دەڵێ:

- ئایا ئەگەر تەنها جارێک پێی بڵێ هۆش، یان هەچە بەس نیە؟

- کابرا دەڵێ: ئاخر مامۆستا ئەوە کەرە خۆ تێ ناگات.

مەلای گەورەش دەڵێ:

- خوای گەورەش لە قورئانی پیرۆزدا لەبەر کەرێکی وەکو جەنابت هەندێ وشە و ئایەت زۆر دووبارە دەکاتەوە، سا بەڵکو تێ بگەیت، کەچی هێشتاش هەر تێناگەیت. کابرا بێ دەنگ بوو و نوقەی لێبڕا.

## بۆ پەنجەرە شکاوەکە چاک ناکەیتەوە؟

ژنێک بە پیاوەکەی وت:

- پیاوەکە ئەوە بۆ ئەو پەنجەرە شکاوە چاک ناکەیتەوە؟

- پیاوەکە: بۆ چاکی بکەمەوە؟

- ژنەکە: تاوەکو دراوسێکانمان نەمبینن!

پیاوەکەش خێرا وەڵامی دایەوە و وتی:

- بڕوابکە ژنەکە، ئەگەر بتبینن خۆیان دێن لە سەر حیسابی خۆیان چاکی دەکەنەوە.

## سێ مشکەکە

پادشایەک خەون دەبینێ، بانگی یەکێک لە خەون لێکدەرەوەکان دەکات و پێی دەڵێ:

- من لە خەونمدا سێ مشکم بینین، یەکێکیان قەڵەو و یەکێکیان لاواز و ئەوەی تریان کوێر بوو، ئایا ئەو خەونە واتای چییە؟

کابرای ڕاڤەکاری خەونیش دوای کەمێک بیرکردنەوە وتی:

- گەورەم، مشکە قەڵەوەکە سەرۆک وەزیرانتە، مشکە لاوازەکەش گەل و قەومەکەتە، مشکە کوێرەکەش خۆتی و ئاگات لە هیچ نیە.

## وەڵامێکی سۆقرات

ڕۆژێکیان سۆقرات لە شوێنێک دانیشبوو جۆرە گیایەکی دەخوارد، لەو کاتەدا کەسێک لە دارو دەستەکانی پادشا بەلایدا تێپەڕ دەبێت و بە سۆقرات دەڵێ:

- ئەگەر بۆ جارێکیش خزمەتی پادشات کردبا ئێستا حاڵت بەو شێوەیە نەدەبوو و گیات نەدەخوارد.

سۆقراتیش وەڵامی دایەوە و وتی:

- تۆش ئەگەر ئەو گیایەت خواردبا ناچار نەدەبووی خزمەتی کەس بکەیت.

## کێ کەری کێیە؟

لەیەکێک لە لادێکانی کوردستان، ڕۆژێکیان مەلای گوند بەسواری کەرەکەی بەرەو بێستان و شینایییەکانی دەچێت، لە ڕێگەدا چاوی بە میری ناوچەکە دەکەوێت، میریش دەیەوێ گاڵتەیەک لەگەڵ مەلادا بکات، دوای سڵاوکردن بە مەلا دەڵێ:

- مەلا کەری کێیە؟ (دیارە مەبەستی ئەوەیە کە ئەو کەرە هی کێیە) بەڵام ئەو ڕستەکە کورت دەکاتەوە تاوەکو گاڵتە لەگەڵ مەلادا بکات. مەلاش هەر لەسەر هەمان شێوازی قسەکردنی ئەو وەڵامی میر دەداتەوە و دەڵێ:

- میر کەری مەلایە.
میر پێکەنی و زانی لەگەڵ مەلا دۆڕا

## دەتەوێ چۆن بمری؟

گەنجێک تاوانێک دەکات و پادشاش دەڵێ:
- سزای ئەو تاوانەت تەنها مردنە، بەڵام بۆ شێوازی مردنەکەت خۆت ئازادی کە دەتەوێ بە چ شێوازێک بمری.
گەنجەکەش دوای بیرکردنەوە وتی:
- واتە خۆم دەست نیشانی شێوازی مردنەکەم بکەم؟
- پادشا: بەڵێ.
گەنجەکەش وتی:
- باشە، من پێم خۆشە بە دەردی پیری بمرم!
پادشا زۆر سەرسام بوو بە لێهاتویی گەنجەکە و سزاکەی بۆ سوک کرد.

## ئەحواڵ پرسینی دووڕوانە

ئیبن سیرین بە کەسێکی ووت:
- چۆنی؟
- ئەویش وتی: دەبێ حاڵی کەسێک چۆن بێت کە (٥٠٠) دیرهەم قەرزارە و خێزاندارە و خاوەن منداڵە و هیچی کاریشی نیە؟

ئیبن سیرینیش گەڕایەوە بۆ ماڵ و هەزار دیرهەمی هێنا و دای بە کــابرا و ووتی:
- (٥٠٠) دەرهەمــی بدە بە خاوەن قەرزەکە و باقیەکەیشی بکە بە خەرجی ماڵــەوە، بەڵام من جارێکی تر لە حاڵی کەس ناپرسم؟
- وتیان: خۆ ناچار نەبووی قەرزەکەی بۆ بدەیتەوە و خەرجی بۆ بدەیت؟
- وتـــی: کاتێک لە حاڵـی کەسێک دەپرســن و ئەو باسی حاڵی خۆتان بۆ دەکات و گرفتارە، ئەگەر چارەسەرێکـــی بۆ نەدۆزنەوە، ئەوا دڵنیابن کە ئەحواڵ پرسینەکەتان ئەحواڵ پرسینێکی موونافیقانەیە.

## ئێوە دەیکوژن و من نانی پێبدەم؟

سەرانی قوڕەیش چوونە لای ئەبو تالیبی مامی پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێیان وت:
- تۆ محمد بدە دەستی ئێمە، لە جیاتی ئەویش عەمارەی کوڕی وەلید بۆ خۆت ببە!
ئەبو تاڵیبیش وتی:
- ئێوە محمد دەبەن دەیکوژن، منیش دەبێ نان بە عەمارە بدەم، ئایا ئەوە داپەروەرییە؟

## باشتر له دینار و دیرهەم

له دانایەکیان پرسی:

- ئایا شتێک هەیە باشتر بێت له دینار و دیرهەم؟

- وتی: بەڵێ.

- وتیان: چییە؟

- وتی: ئەو کەسەی که له پێناوی خودا دەیانبەخشێ.

## دەستەکانی دەهێنێتە خوارەوە

به زانای گەورە ئیبن عوسەیمینیان وت:

- ئەگەر بەندە له دوعاکانی تەواو بوو چی بکات باشە؟

- وتی: دەستەکانی بهێنێتە خوارەوە.

## با کەسێکی گەورەتر قسە بکات

وەفدێک هاتە لای ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی عبدالعزیز، هەر که گەیشتن یەکێک له گەنجەکانی ناو وەفدەکە دەستی کرد به قسە کردن، پێشەوا عومەریش وتی:

- با بەتەمەنتیرینتان قسە بکات ئەی گەنج.

گەنجەکەش وەڵامی دایەوە و وتی:

- ئەی ئەمیری باوەڕداران قوڕەیشیش زۆر کەسی لەتۆی بەتەمەنتر تێدایە!

- ئەوسا پێشەوا عومەر وتی: قسە بکە ئەی گەنج.

## وەڵامی عبداللەی کوڕی زوبەیر بۆ عومەری کوڕی خەتاب

جارێکیان پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب (خودا لێی ڕازی بێت) بەلای کۆمەڵە منداڵێک تێپەڕ دەبێت، کاتێک منداڵەکان پێشەوا عومەر دەبینن هەموویان ڕادەکەن، جگە لە عبداللەی کوڕی زوبەیر، پێشەوا عومەریش پرسیاری لێکرد:

- ئەی تۆ بۆ وەک هاوڕێکانت ڕات نەکرد؟

عبداللە زۆر بە متمانەوە وەڵامی پێشەوای دایەوە و وتی:

- هیچ تاوانێکم ئەنجام نەداوە تا لێت بترسم، ڕێگا هێندە تەسک نیە تا بۆت فراوان بکەم.

پێشەوا عومەر زۆر بە متمانە بەخۆبوونی زوبەیر سەرسام بوو.

## حەق بناسە پەیرەوانی دەناسی

پیاوێک هاتە لای پێشەوا عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) و پێی وت:

- ئایا دەزانی کە ئێمە وا گومان دەبەین کە تەلحە و زوبەیر لەسەر ڕێبازێکی گومڕان؟

پێشەوا عەلیش کە هەمیشە وەڵامی جوان و ژیرانەی ئامادەبوو پێی وت:

- بەڕاستی تۆ باش تێکەڵت کردووە ئەی پیاو، حەق بە پیاوەکانی ناناسرێتەوە، بەڵکو پیاوان بە حەق دەناسرێنەوە، بۆیە حەق بناسە د پەیڕەوانی دەناسی.

## ڕوح و ئاگر و ڕوناکی چرا

به عبداللەی کوڕی عەباسیان (خودا لێی ڕازی بێت) وت:

- کاتێک ڕوح لە جەستە جیا دەبێتەوە دەچێتە کوێ؟

ئەویش پێی وتن:

- ئەی ئاگر و ڕوناکی چرا دەچێتە کوێ کاتێک دەکوژێتەوە؟

## شەیتان جگە لە تۆ بەریدێکی تری دەست نەکەوت؟

ڕۆژێک پیاوێک هاتە لای وەهبی کوڕی مونەبیهی صەنعانی و پێی وت:

- فلان کەسە جنێوی پێت دا و قسەی پێ وتی.

وەهبیش پێی وت:

- ئایا شەیتان جگە لە تۆ بەریدێکی تری دەست نەکەوت؟

## ئەی خودا لە کوێیە؟

نافع دەگێڕێتەوە، دەڵێ:

- جارێکیان عبداللەی کوڕی عومەر لەگەڵ چەند هاوەڵێک دەچنە دەرەوەی شاری مەدینە، لە شوێنێک دانیشتن و نانیان خوارد، لەو کاتەدا شوانێک بە لایاندا ڕەت دەبێت، عبدالله بانگهێشتی سەر سفرەکەی دەکات، بەڵام شوانەکە دەڵێ:

- من بە ڕۆژووم.

- عبدالله دەڵێ، لە ڕۆژێکی ئاوا گەرم و لەو شاخە وشکە و شوانیش دەکەیت و بە ڕۆژووشیت؟
- کابرای شوانیش دەڵێ: بەڵێ.
ئینجا عبدالله دەیەوێ کابرای شوان تاقی بکاتەوە، پێی دەڵێ:
- بۆ مەڕێکمان پێ نافرۆشیت و لێرە گۆشتەکەی ئامادە بکەین و تۆش ڕۆژووەکەت بشکێنە و وەرە لەگەڵمان بخۆ.
- شوانەکە: ئاخر ئەوانە هی من نین.
- عبدالله: تۆ پێمان بفرۆشە و دواتر بە خاوەنەکەی بڵێ ونم کردووە، یان گورگ خواردوویەتی، پارەکەش بخە گیرفانی خۆتەوە!
شوانەکە دەست بەرزدەکاتەوە و دەڵێ:
- ئەی خودا لە کوێیە؟
عبدالله تاماوەیەکی زۆر هەر قسەی شوانەکەی دووبارە دەکردەوە و دەیوت: ئەی خودا لە کوێیە؟

## دراوسێکەم فرۆشت

ئەبو ئەسوەدی دوئەلی دراوسێیەکی زۆر خراپی هەبوو، بەردەوام ئازاریان دەدا، شەوێکیان ناو حەوشەی ماڵی ئەبو ئەسوەد بەرد باران دەکەن، کاتێک بەیانی دادێت ئەبو ئەسوەد پێیان دەڵێ:
- ئەوە بۆ واتان لە ماڵەکەم کردووە؟
ئەوانیش دەڵێن:

- خودا بەرد بارانی کردووی.
ئەبو ئەسوەدیش دەڵێ:
- درۆ دەکەن، ئەگەر خودا بەردم تێبگرێ بەرم دەکەوێ و دەمپێکێ، بەڵام ئێوە بەردم تێ دەگرن و بەرم ناکەوێ.
دوای ئەوەی تەواو بێزار دەبێ، ئەبو ئەسوەد خانوەکە دەفرۆشێ، لێی دەپرسن:
- ئەوە خانوەکەت فرۆشت؟
- ئەویش دەڵێ: نەخێر، دراوسێکەم فرۆشت.

## کوشتنی مێشولە جائیزە؟

کۆمەڵێک لە ئەهلی عێراق لە یەکێک لە سەفەرەکانی حەج چوونە لای عبداللەی کوڕی عومەر و لێیان پرسی:
- ئایا کوشتنی مێشولە لە کاتی ئیحرام بەستن لە حەج جائیزە یاخود نا؟
عبدالله وەڵامی دانەوە و وتی:
- حوسەینی کوڕی عەلی و ئال و بەیتی پێغەمبەرتان لە کەربەلا کوشت، ئێستاش هاتوون لە کوشتنی مێشولەیەک دەپێچنەوە؟

## تا ئێسقانی بەدیار دەکەون

لە شەعبیان پرسی:
- ئایا بەندە لە کاتی ئیحڕامدا بۆی هەیە جەستەی خۆی بخورێنێ؟

- شەعبیش وتی: بەڵێ.
- وتیان: تا چ ئەندازەیەک؟
- وتی: تا ئێسقانی بە دیار دەکەوێ.

## حەڵاڵ و جوان

پیرەژنێک بە مێردەکەی خۆی دەڵێ:
- باشە ئەوە شەرم لەخۆت ناکەیت سەیری ژنانی تر دەکەیت، لە کاتێک ژنێکی حەڵاڵ و جوانت هەیە؟
پیاوەکەش وتی:
- بۆ حەڵاڵەکە بەڵێ، بەڵام بۆ جوانەکە نەخێر.

## یارمەتیم بدە بۆ تەواوکردنی خانووەکەم

ڕەبیعەی کوڕی عوقەیلی یەڕبوعی دێتە لای موعاویە و پێی دەڵێ:
- ئەی پێشەوای باوەڕداران، خەریکی دروستکردنی خانوم ئەگەر یارمەتیەکم بدەیت.
موعاویەش لێی پرسی:
- خانوەکەت لە کوێیە؟
- ڕەبیعەش وتی: لە بەسڕایە قوربان.
- موعاویە: ڕووبەڕەکەی چەندە؟

- ڕەبیعە: کەمێک لە دوو فەرسەخ* زیاترە.
موعاویەش پێی دەڵێ:
- تۆماڵت لە بەسڕایە، یان بەسڕا لە ماڵەکەی تۆدایە؟

## چاکت کرد

ڕۆژێک موتەوەکیل بەردێکی گرتە باڵندەیەک، بەڵام نەیپێکا.
ئیبنو حەمدانیش پێی وت:
- دەست خۆش چاکت کرد.
- موتەوەکیل وتی: ئایا گاڵتەم پێ دەکەیت؟ خۆ نەم پێکا.
ئیبنو حەمدانیش وتی:
- چاکت لەگەڵ باڵندەکە کرد و نەتکوشت.

## چۆن ئەهلی ئەم زەمانە دەبینی؟

لە ئەشعەبیان پرسی:
- چۆن خەڵک و ئەهلی ئەو زەمانە هەڵدەسەنگێنی؟
ئەشعەب وت:

---

* فەرسەخ: ئەسڵی وشەکە فارسییە، پێوەرێکە لە کۆندا بەکارهاتووە، هەر فەرسەخێک بە نزیکەیی بەرامبەر (٣) میلە، هەر میلێکیش (١٦٠٠) مەترە، بەو پێیە هەر فەرسەخێک نزیکەی (٥) کیلۆمەترە.

- داوای موڵکی پادشا دەکەن و وەک کۆیلەیەکیش دەبەخشن.

## تا تۆم بیربکەوێتەوە

کابرایەک دەیوسیت فێڵ لە ئەشعەب بکات و ئەنگوستیلەکەی لێ بستێنێ، بە ئەشعەبی وت:

- ئەو ئەنگوستیلەی دەستتم پێبدە، تا هەر کات بیبینم تۆم بیربکەوێتەوە!

ئەشعەبیش وەڵامی دایەوە و وتی:

- پێت نادەم، تا هەر کات سەیری دەستت بکەیت کە ئەنگوستیلەی تێدا نیە منت بیربکەوێتەوە و بڵێی ئەشعەب ئەنگوستیلەکەی پێ نەدام.

## دوو شاعیری گەمژە

دوو شاعیری گەمژە لە بن دارێک دانیشت بوون و جەوی شیعریان وەرگرتبوو، بە نۆرە شیعریان بۆ یەکتر دەوت، شیعرەکانیان زۆر بێ مانا و گەمژانە بوون، کابرایەکی ئەدیب و شاعیریش لەسەر دارەکە بوو، گوێی لەو شیعرە بێ مانایەی ئەو دوو شاعیرە گرتبوو، کاتێک تەواو لە شیعرەکانیان بێزار بوو لەسەروەی دارەکە میزێکی هەڵدا و بە بەسەری هەردووکیانی داکرد.

دوو شاعیرەکەش لێی توڕەبوون و سکاڵایان بردە لای دادوەر، دادوەریش کابرای ئەدیبی بە مانگێک زیندانی و (٥٠٠) دینار سزادا.
کابرای ئەدیب بە دادوەری وت:
- من بە سزادانەکەت ڕازیم، بەمەرجێ بۆ چەند خولەکێک گوێ لە شیعری ئەو دوو گەمژەیە ڕابگری.
دادوەریش کە کەسێکی زمانزان و لێهاتووبوو مەرجەکەی ئەدیبی جێبەجێ کرد و گوێی لە شیعر هەردوو گەمژەکە گرت.
کاتێک بۆماوەی چەند خولەکێک گوێی لەو دوو شاعیرە گەمژەیە گرت، بە توڕەیی مستێکی لە مێزەکەی بەردەمی دا و وتی:
- بڕیاری سزادانەکە گۆڕا، بۆ دوو مانگ زیندانی و (١٠٠٠) دینار!
(واتە دوو قاتی سزاکەی پێشوو).
کابرای ئەدیب وتی:
- بۆچی جەنابی دادوەر؟
دادوەر وتی:
- چونکە تۆ گوێت لەو شیعرە قۆڕانە بووە و تەنها میزت پێیاندا کردووە، دەبوو پیسایشت بەسەر سەریاندا کردبا.

## وەڵامی دایکێک

لە دایکێکیان پرسی:
- چۆن توانیت قەناعەت بەمنداڵەکەت بکەیت، کە لەبری یارییە ئەلیکترۆنییەکان کتێب بخوێنێتەوە؟ !
دایکەکە لە وەڵام وتی:

- منداڵەکانمان بەگوێمان ناکەن، بەڵکو لاساییمان دەکەنەوە!

**وتم: نابیت بە مرۆڤ!**

باوکێک هەبوو، کوڕێکی زۆر لاساری هەبوو، باوکەکە هەمیشە بە کوڕەکەی دەوت:

- کوڕم تۆ هەرگیز نابیت بە مرۆڤ!

دوای ماوەیەک کوڕەکە لە باوکی دور دەکەوێتەوە، پاش چەندین ساڵ، کوڕە دەبێت بە والی و بەرپرسی ئەو ناوچەی خۆیان.

ڕۆژێکیان بە پاسەوانەکانی دەڵێ:

- بڕۆن باوکم بۆ بهێنن، پاسەوانەکانی دەچنە لای باوکی و بە لێدان و قامچی باوکەکەیان هێنا بۆ لای کوڕە- والی-.

- والی دەڵێ: باوکە تەماشام کە، تۆ هەر ئەت وت من نابم بە هیچ، فەرموو تەماشا بکە، ئێستا ئەڵێی چی؟ خۆ دەمبینی چ دەسەڵاتێکم هەیە؟

باوکەکەش سەری کزی بەرز دەکاتەوە و دەڵێ:

- ڕۆڵە من نەموت تۆ نابی بە والی و دەسەڵاتدار، من هەمیشە وتومە تۆ نابی بە مرۆڤ! ئێستاش ڕاستە بویتە والی، بەڵام نەبویت بە مرۆڤ! ئایا مرۆڤ هەیە لەو دونیایەدا بە قامچی و شەقی پاسەوانەکانی باوکی خۆی ڕاپێچ بکات؟

والی سەری داخست و هیچی بۆ وتن نەما.

## بۆ دوای زانست ناکەوی؟

زانایەک بە بەلای شوانێکدا تێپەڕ دەبێت و لێی دەپرسێ:

- چەند ساڵە کاری شوانی دەکەیت؟

شوانەکەش دەڵێ:

- (١٥) ساڵ.

زاناکە دەڵێ:

- بۆ لە جیاتی شوانی بە دوای زانست ناکەوی؟

شوانەکە دەڵێ:

- کورتەی هەموو زانستەکان دەزانم و فێریان بووم.

- زاناکە: ئادەی هەرچی دەیزانی و فێری بووی بەمنیشی بڵێ:

-شوانەکە: کورتەی زانستەکان پێنج شتن: ١- تا ڕاستی هەبێت، درۆ ناکەم. ٢- تا حەلاڵ هەبێت، حەرام ناخۆم. ٣- تا خۆم کەم و کورتی و(عەیبم)هەبێت، لە کەم و کورتی خەلکی ناکۆڵمەوە. ٤- تا خودا ڕزقم بدات، ناچمە بەر دەرگای هیچ کەسێک. ٥- تا نەچمە بەهەشت لە فڕوفێڵی شەیتان پارێزراو و بێ ئاگا و ئارام نابم.

زاناکە وتی:

- دەی بەڕاستی تۆ تەواوی زانست دەزانیت، هەرکەسێکیش ئەو پێنج ئاکار و ڕەوشتەی هەبێت، ئەوا پێویستی بە پەرتوکی تری ڕەوشت و زانست نییە.

## من به چوار هێلکە نەبێت تێر ناخۆم!

وەکو بەسەرهاتێکی پێکەنین ئامێز گێڕدراوەتەوە:

دەڵێن:

ژنەکەی بیستبووی کە مێردەکەی بەنیازە ژنی تر بهێنێت، بۆیە کاتێک مێردەکەی دەگەڕێتەوە بۆماڵ بۆ نانی ئێوارە چوار هێلکەی بۆ دەکوڵێنێ، دوای کوڵاندنیان هەر هێلکە و ڕەنگێکی لێدان و لەگەڵ نان و سەوزە و شتیتر بردیە بەردەمی مێردەکەی.

پیاوەکە ئەم کارەی پێ سەیربوو بە ژنەکەی دەڵێ:

- ژنەکە ئەم هێلکە ڕەنگاوڕەنگانە چین؟

ژنەکە دەڵێ:

- پیاوەکە تۆ نانەکەت بخۆ دوایی پێت دەڵێم.

پاش ئەوەی پیاوەکە هەر (٤) هێلکەکەی خوارد و تەواوبوو ژنەکە پرسی:

- پیاوەکە ئەوهێلکانە هیچ جیاوازیەکیان هەبوو جگە لە ڕەنگەکانیان؟

- پیاوەکە: نەخێر فەرقیان نەبوو، بەڵام مەبەستت چیە؟

- ژنەکە: ئێ پیاوەکە ژنەکانیش هەروان هەمویان یەک شتن، تەنها ڕەنگ و شێوەیان جیاوازە کەواتە بۆچی ژنی ترم بەسەر دەهێنی؟

- پیاوەکە: ئەها، تۆڕاست دەکەیت، بەڵام ئاگات لێیە من بە(٤) هێلکە نەبێت تێرنابم؟

## سەلام کردن لە گوێ درێژ!

مەلای مەشهور هەر کاتێک دەچووە ناو تەوێلە سڵاوی لە گوێ درێژەکەی دەکرد.

لێیان پرسی:

- مەلا ئەمە گوێ درێژە، خۆ تێناگات کە تۆ سەلامی لێ دەکەیت؟

وەڵامی دانەوە و وتی:

- ئێوە ڕاست دەکەن ئەو گوێ درێژە، بەڵام خـۆ من مرۆڤم، من مرۆڤ بوونـی خۆمی پێ دەسەلمێنم، جا با ئەو هەر تێ نەگات.

## ئێستا دەزانی ڕۆژانە چیم کردووە و چی دەکەم؟

پیاوەکە لە سەر کار گەڕایەوە.

بینی منداڵەکانی بە جل و بەرگی خەوتن وا لە کۆڵانی گەڕەک یاری دەکەن، سەرو پرچیان تێک ئاڵاو و ئاڵۆزە و دەم و چاویان نەشۆراوە!

دەرگای ماڵەکەیان دانەخراو و ئاوەڵەیە!

سەیرە!

کاتێک چووە ژوورەوە بینی سەر قادرمەکان زۆر پیسن، جێگاکانی خەوتن هەروا لە گۆڕێن! سەر مەغسەلی مەتبەخ پڕە لە قاپی پیس و زبڵدانەکە خەریکە زبڵ و خاشاکی بەسەردا دەرژێ، سفرەی نانی بەیانی هەر لە گۆڕێیە و دەستی لێنەدراوە، کاتێک بەرەو لای گەرماوەکە چوو قاچی کەوتە سەر سابونێک و خەریک بوو بە پشت

دابکەوێ، ئەوێش لە هەموو جێگاکانی تر بێ سەروبەرتر بوو، جلە پیسەکان هەر لەوێ کەوتوون! کاشی دیوار و زەوی هەمووی پەڵە و پیسیە!
نە نانێک ئامادەیە بۆ خواردن، نە ئاوێکی سارد!
دەنگی تەلەفیزیۆنەکە بەرزبۆتەوە...یاری منداڵەکان هەروا پەرت و بڵاون!
دەرگای سەلاجەکە کراوەیە و پەرداخێکی شوشە لەوێ شکاوە و هەڵنەگیراوەتەوە...
ئەی خودایە ئەوە چی ڕوویداوە!
پیاوەکە زۆر ترسا کە هاوسەرەکەی توشی کارەساتێک بووبێت!
بە شڵەژاوی بانگی کرد! ژنەکە...ژنەکە...تۆ لە کوێی؟
ئا لەو کاتەدا هاوسەرەکەی لە ژووری میوان بە خۆی و ئەو ڕۆمانەی کە دەیخوێندەوە هاتە دەرەوە و بە پیاوەکەی وت:
- ها چی بووە پیاوەکە؟
پیاوەکە وتی:
- ئەوە لەو ماڵە چی ڕوودەدات، تۆ خەریکی چی؟
ژنەکە بەزەردەخەیەک وەڵامی دایەوە و وتی:
- پیاوەکە هەموو ڕۆژێک کە پێت دەڵێم ئەمرۆ زۆر هیلاک بووم و زۆر کارم هەبوو، تۆ گاڵتەم پێدەکەیت و دەڵێی: بۆچیت کردووە، ماڵ چ ئیشێکی تیادایە تا ئەنجامی بدەیت!

فەرموو سەیربکە، تەنها ئەمرۆ کارەکانم نەکردووە، تا بزانی من ڕۆژانە چی دەکەم!
پیاوەکە داوای لێبوردنی کرد و بەڵێنیدا کە جارێکی تر ئەو قسەیە نەکاتەوە.

## شەیتان وازت لێناهێنێ!

ئیبن جەوزی لە کتێبەکەیدا (أخبار الأذكياء) دەگێڕێتەوە، دەڵێ:
- کابرایەک دێتە لای ئەبو حەنیفە و پێی دەڵێ: کۆمەڵێ پارەم لە شوێنێک شاردۆتەوە، بەڵام ئێستا شوێنەکەم بیرنایەتەوە، ئێستا من چی بکەم.
ئەبو حەنیفەش پێی دەڵێ:
- ئەمشەو هەستەوە، تا نوێژی بەیانی هەر شەو نوێژ بکە، بە دڵنیایی شوێنەکەت بیر دەکەوێتەوە.
کابراش بە قسەی دەکات و ئەو شەوە دەست دەکات بە شەونوێژ، هێشتا چارەگەک لە شەو ڕۆیشتبوو کابرا شوێنەکەی بیرکەوتەوە،
بۆ بەیانی گەڕایەوە لای ئەبو حەنیفە و پێی وت:
- پارەکەم بینیەوە، بەڵام تۆ چۆن زانیت کە دەیدۆزمەوە؟
ئەبو حەنیفەش پێی وت:
- دەمزانی شەیتان لێناگەڕێ شەونوێژەکەت بکەیت و بیرت هەر دەخاتە لای پارەکەت و بیرت دێتەوە کە لەکوێت داناوە.

کەسێک پێدەزانی نزای گیرابێت؟

لە پیاو چاکێکیان پرسی:

- کەسێک دەناسیت نزاکانی گیرابێت؟

لەوەلامدا وتی:

- نەخێر، بەلام خودایەک دەناسم کە نزاکان گیرادەکات.

## واژووی نەکردووە!

دەگێڕنەوە کە وەزیرێک هەبوو، زۆر سینە فراوان و خاکی بوو بەرامبەر بەو ڕەخنە بونیاتنەرانەی کە لێی دەگیران، بەڵام لە هەمان کاتیشدا وەڵامی زۆر دەمکوتکەر و ژیرانەی پێبوو بۆ ئەو کەسانەی کە ڕەخنەی ڕوخێنەریان لێ دەگرت.

ڕۆژێکیان لەلایەن یەکێ لە کەسە نەیارەکانی نامەیەکی بۆ دێت، کاتێک کە نامەکە دەکاتەوە تەنها تیایدا نووسراوە (کەر).

بۆ بەیانی وەزیر وێنەی نامەکە لە ڕۆژنامەیەک بڵاو دەکاتەوە و لەسەری دەنووسێ:

- عادەتی خەڵک وایە کە نامەیەک دەنووسن زۆر جاران ئەوە لە یاد دەکەن کە ناوی خۆیان بنوسن، بەڵام ئەو نامەیەی دوێنێ بە دەستی من گەیشتووە پێچەوانەیە، کابرا تەنها ناوی خۆی نووسیوە و واژووی نەکردووە!

## سزا و پاداشت لە یەک کاتدا!

کەسێک دێتە لای هارونە ڕەشید و دەڵێ:

- من دەتوانم شتی زۆر سەیر و سەمەرە ئەنجام بدەم، هارونیش پێی دەڵێ:

- ئەو شتە چییە کە تۆ دەیکەیت، فەرموو با بیبینین.

کابراش پاکەتێک دەرزی دەهێنێتە دەرەوە، یەکێک لە دەرزیەکان بە زەویدا دەچەقێنێ، دواتریش دەست دەکات بە هەڵادانی دەرزییەکانی تر، هەر دەرزیەک کە هەڵی دەدا، دەچووە کونی دەرزی پێشتر و لێک گیر دەبوون!

کاتێک هەموو دەرزیەکانی هەڵدان و لە کارەکەی سەرکەوتوو بوو، کابرا زەردەخەنەیەکی کرد و سەیری هارونی کرد، چاوەڕێ بوو کە پاداشتێکی گەورە بکرێ، بەڵام هارون فەرمانی کرد و وتی:

- سەد قامچی لێ بدەن، سەد دیناریشی پێ بدەن!

هەموان ئەو بڕیارەی هارونیان لا سەیر بوو، لێیان پرسی:

- ئەوە واتای چی؟ سزا و پاداشت لە یەک کاتدا؟

- هارون وتی: سەد دینارەکە بۆ زیرەکی و لێهاتوویەکەیەتی، سەد قامچیەکەش لەبەرامبەر ئەوەیە کە زیرەکی و لێهاتویی خۆی لە شتێک خستۆتەگەڕ کە هیچ سودێکی نیە.

## ئێستا لە خواری خوارەوە دەبووی

ڕۆژێکیان موتەوەکیل قسەی بۆ خەڵک دەکرد و کۆمەڵێک لە خەڵکیش دەورەیان دابوو، لە ئامادەبووانی پرسی:

- ئایا دەزانن یەکەم شت کە عوسمانی کوڕی عەفان بە هۆیەوە ڕەخنەی لێگیرا چی بوو؟

- ئەوانیش وتیان: نەخێر، نازانین، چی بوو؟

موتەوەکیل وتی:

- کاتێک پێغەمبەری خودا (ﷺ) وەفاتی کرد، پێشەوا ئەبو بەکر (خودا لێی ڕازی بێت) پایەیەک لە مینبەر هاتە خوارەوە، کاتێک عومەری کوڕی خەتاب (خودا لێی ڕازی بێت) خەلافەتی وەرگرت ئەویش پایەکی تر لە قادرمەکە هاتە خوارەوە، بەڵام کاتێک کە عوسمان خەلافەتی وەرگرت چووەوە شوێنی پێغەمبەری خودا (ﷺ) و هەنگاوێک دانەبەزی، لە کاتێکدا دەبوو هەنگاوێکی تر هاتبایە خوار شوێنی عومەر، ئا ئەوە یەکەم شت بوو کە عوسمانی کوڕی عەفان لەلایەن موسڵمانانەوە ڕەخنەی لێ گیرا.

ئا لەو کاتەدا عەبادە هەڵدەستێتەوە و دەڵێ:

- ئای چەندە گەورە و ژیر بووی ئەی عوسمان!

- موتەوەکیل دەڵێ: بۆ؟ شتێکی باشی کردووە؟

عەبادە دەڵێ:

- بەڵێ گەورەم تا بڵێی شتێکی ژیرانە و باشی کردووە، چونکە ئەگەر وای نەکردبا دەبوو ئێستا جەنابت بە دەیان مەتر لە خوار زەویەوە وتارت بۆ ئێمە خوێندبایەوە!
- موتەوەکیل وەڵامێکی بۆ عەبادە پێ نەبوو.

## ئەگەر شیعرم جۆ بوایە

کەسێک بەزمانێکی زبر ڕەخنە لە شیعرەکانی موتەنەبی دەگرێت و دەڵێ:
شیعرەکانت بێ مانان و هیچ چێژێکی ئەدەبیان نیە.
موتەنەبیش زۆر بە توندی وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ:
((لوكان شعري شعير لأكلته الحمير لكن شعري شعورا فهل للحمير شعور؟))
واتە: ((ئەگەر شیعرەکانم جۆ بونایە ئەوا گوێدرێژ دەیخواردن، بەڵام شیعرەکانم هەست و شعورن، ئایا گوێدرێژ شعوری هەیە؟)).

## بۆچی بە وتەکانت سەرسامیت؟

کابرایەک بە ئیاسی کوڕی موعاویەی وت:
- هیچ عەیب و کەم و کورتیەکت نیە، جگە لەوەی کە زۆر بە وتەکانت و بەخۆت سەرسامیت.
ئیاسیش وتی:
- ئایا تۆ بە وتە و کەسایەتیم سەرسام نیت؟

- کابرا وتی: با.
- ئیياس: کەواتە من لەتۆ ئەولاترم و لەپێشترم کە بەخۆم سەرسام بم.
کابرا وتی:
- ئەی بۆ پەلە دەکەیت لە بڕیار و وەڵامەکانت دا؟
- ئیياس: ئەی پیاو تۆ چەند پەنجەت هەیە؟
- کابرا: هەر دەستی پێنج پەنجە.
- ئیياس: بۆ وا زوو وەڵامت دایەوە؟
- کابرا: ئاخر ئەوە شتێکی بەرچاوە و پێویست بە بیرکردنەوە ناکات.
- ئیياس: دە کەواتە بزانە، لای من هەموو شتەکان بەرچاون و پێویستم بەوە نیە زۆر بیریان لێبکەمەوە.

## کامیان ناشیرنترن؟

لە دانایەکیان پرسی:
- ئایا پێت وانیە کە ناشیرینترین کەس ئەو کەسەیە کە ڕژدوو بەخیل و ڕەزیلە؟
وەڵامی دانەوە:
- نەخێر، بەڵکو لەو ناشیرینتر ئەو کەسەیە کە باسکردنی بەخشینەکانی زۆر زیاترە لە بە خشینەکانی!

## دڵێک هەژارە کە خودای تێدا نەبێ

پیاوێکی دەوڵەمەند بەلای هەژارێک تێپەڕ دەبێت و بە لوت بەرزیەوە دەڵێ:

- لام سەیرە هەژارەکان بە گیرفانی بە تاڵەوە چۆن دڵیان ئاسودە دەبێ.

هەژارەکەش لێی هەستایەوە و پێی وت:

- قوربان ڕاستە ئێمە گیرفانەکانمان بەتاڵە، بەڵام دڵمان پڕە لە ئارامی، چاک بزانە لای ئێمە هەژار ئەو کەسەیە کە دڵەکەی خۆشەویستی خودای تێدا نەبێ.

## وەڵامی جوتیارێک بۆ پادشا

ڕۆژێک پادشایەک ڕوو دەکاتە ئەو دەشت و دەرە بۆ ئەوەی کاتێکی خۆش بەسەر ببات، لەڕێگادا کێڵگەیەکی گەورەی بەرچاو دەکەوێت، کەتیایدا کەرێک ئەرکی ئاودانی کێڵگەکە ڕادەپەڕێنێت، بەسووڕاندنی ناعوورەی ئاوەکە.

پادشاکە زۆر سەرسام دەبێت بە دەنگی ئەو زەنگوڵەی کە لە ملی کەرەکەدایە، لە جوتیارەکە دەچێتە پێشەوە و لێی دەپرسێ:

- پێم نالێیت چ نهێنیەک لەوەداهەیە کە تۆ ئەم زەنگوڵە گەورەیەت بە ملی ئەو کەرە هەڵواسیوە؟

جوتیارەکەش دەڵێت:

- من بەهۆی دەنگی ئەو زەنگوڵەوە دەزانم کە کەرەکە کاردەکات یاخو نا، چونکە هەرکات بجوولێتەوە ئەوا دەنگی زەنگوڵەکەم گوێ لێدەبێت، کاتێکیش دەنگی زەنگوڵەکە نامێنێت، خێرا دەچم کەرەکە ئاگادار دەکەمەوەو دەیخەمەوەکار.

پاشاکە وتی:

- باشە ئەی ئەگەر کەرەکە لەکارکردن وەستا ، بۆ هەڵخەڵەتاندنی تۆش دەستی کرد بە سەرلەقاندن بۆ ئەوەی گوێت لەدەنگی زەنگوڵەکە بێت و وابزانێت بەردەوامە لەکارکردن؟

جوتیارەکە زەردەخەنەیەکی کردوو وتی:

- جا گەورەم خۆ عەقڵی کەر وەکو عەقڵی پاشا نیە تاوەکو فێڵ لە خەڵک و میللەت بکات.

پادشاکە بێ دەنگ بوو و ڕۆیشت.

## لەشەرمی تۆیە ڕەنگی سور هەڵگەڕاوە

ڕۆژێک هارونە ڕەشید بە ناو بازاڕدا پیاسەی دەکرد، لەناکاو چاوی بە ئەبو نەواسی شاعیر دەکەوێت کە شوشەیەک ئارەقی لە دەست بوو، هارونیش بە ئەبو نەواس دەڵێ:

- ها ئەبو نەواس ئەوە چیە بە دەستەوەیە؟

ئەبو نەواسیش وتی:

- ئەوە ماستە جەنابی خەلیفە.

ـ هارون: ئەبو نەواس خۆ ئەوە ڕەنگی سورە؟
ـ ئەبو نەواس: ئاخر گەورەم ئەوە کە چاوی بە تۆ کەوت لە شەرمان ڕەنگی سور هەڵگەڕا.
هارون سەری لەو وەڵامە خێرایەی ئەبو نەواس سوڕما و پێکەنی.

## بەڵگەم لە قورئاندا هەیە

ڕۆژێکیان ئەبو نەواس قسە بە وەزیری مەهدی (فەزڵی کوڕی ڕەبیع) دەڵێت و زۆر شیعری خراپی لەسەر دەڵێ.
دوای ماوەیەکی کەم ئەو قسانە دەگەنەوە لای فەزڵ و ئەویش زۆر توڕە دەبێت، خێرا فەرمان دەکات کە بیهێنن بۆ کۆشک و سەد قامچی لێبدەن.
کاتێک دەیهێنن و دەست دەکەن بە لێدانی، ئەبو نەواس بانگی فەزڵ دەکات و دەڵێ:
- تکایە چیتر لێم مەدەن، من بەڵگەی پاکی خۆم دەسەلمێنم.
فەزڵیش دەڵێ:
- بەڵگەی تۆ چییە؟
- ئەبو نەواسیش دەڵێ:
- بەڵگەکەم لە قورئانە، خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾ وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ ﴾ [الشعراء: ٢٢٥ - ٢٢٦] واتە: ((ئایا نابینیت کە ئەوانە لە هەموو دۆڵێکدا سەرهەڵدەدەن

و له هەموو شتێک دەدوێن. بەڕاستی ئەوانە شتێک دەڵێن و بەکردەوە نایکەن کردارو گوفتاریان دوورە لە یەکەوە)).
کاتێک ئەوەی وت فەزڵ پێکەنی و فەرمانی کرد کە ئازادی بکەن.

## کوێر بونت لە چی بێبەشی کردووی؟

موتەوەکیل بە ئەبو عەینائی وت:

- هەست دەکەیت بە کوێر بونت لە چ شتێک بێبەش بوویت؟

ئەبو عەیناء وتی:

- لە بینینی جەنابتان و بینینی بەخشندەیی و دەستکراوەییتان.

موتەوەکیل وەڵامەکەی زۆر پێ جوان بوو، بۆیە خەڵاتێکی باشی پێبەخشی.

## خۆشەویستی نابێت لق و پۆپی هەبێ

کوڕێکی گەنج وجوتیارێک بەیەکەوە کاریان دەکرد، گەنجەکە بەجوتیارەکەی وت:

- من دەستگیراندارم و دەسگیرانەکەم زۆر منی خۆش ئەوێت هەمیشە هەستی خۆی بۆمن دەردەبڕێ، بەڵام نازانم من بۆچی وەکو ئەو نیم، ئەو هەستەی ئەو بەمنی دەبەخشێت من ناتوانم بە ئەوی ببەخشم؟ بەهەرحاڵ نکوڵی لەوە ناکەم منیش ئەوم خۆش

ئەوێت، بەڵام هەست دەکەم بەتێپەڕبوونی کات ئەو هەستەم بۆی کەمتر دەبێتەوە.
جوتیارەکە پێی وت:
- تۆ لەگەڵ کچی تر هاوڕێیەتیت هەیە؟
- گەنجەکە وتی: بەڵێ، زۆر قسەیان لەگەڵ ئەکەم، بەڵام تەنیا وەکو هاوڕێ و هیچ هەستێکم نییە بۆیان و من باسی شتی گشتییان لەگەڵ دەکەم.
- جوتیارەکە وتی: ئایا هەندێ جار وشەی ڕۆمانسی دەکەوێتە نێوان قسەکانتان ئەوەش وات لێبکات بەراوردی بکەیت لەنێوان وتەی دەستگیرانەکەت و کچە هاوڕێکانت؟
- گەنجەکە: نکوڵی لەوەناکەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەستگیرانەکەمم خۆشدەوێت و هەستم بۆی هەیە.
- جوتیارەکە وتی: چارەسەرەکەت پێ دەڵێم، بەڵام با ئێستا بە کشتوکاڵەکەمانەوە خەریک بین.
جوتیارەکە سۆندەیەکی ئاوی دایە دەستی گەنجەکە و پێی وت:
- بەباشی بیگرە هەتا من دەچم ئاوەکە بەردەدەمەوە، دواتر لێت وەردەگرمەوە.
جوتیارەکە بەبیانووی کردنەوەی ئاوەکەوە خۆی شاردەوە و دوای ئەوەی ئاوەکەی کردەوە، بە بزمارێک چەند کونێکی لە سۆندەی ئاوەکە کرد، پاشان هاتەوە بۆلای کوڕەکەو پێی وت:
- سۆندەکەم بدەرەوە، ئەویش پێیدایەوە، جوتیارەکە وتی:

- ئەوە چییە؟ بۆچی سۆندەکە ئاوی کەم لێ دێت؟
- گەنجەکە وتی نازانم، پێش ئێستا ئاوی زۆری لێ دەهات، بەڵام نازانم بۆچی وردە وردە کەم بوویەوە؟
- جوتیارەکە وتی: خێرا بڕۆ چاودێری سۆندەکە بکە، گەنجەکە ڕۆیشت و پاشان گەڕایەوە بۆلای جوتیارەکە و وتی:
- مامە گیان، سۆندەکە چەند کونێکی تێدایە و ئاوی لێ دەچێت، لەبەر ئەوەیە ئاو ناگاتە لای ئێمە.
- جوتیارەکە وتی: گیانەکەم تۆش هەستت چەند کونێکی تێبووە و لەو کونانەوە هەستت دەچێت بۆلای هاوڕێ کچەکانت و بەشێکی کەم لەو هەستە دەگاتە دەسگیرانەکەت، کاتێک ئاوەکە بەخێرای دەگاتە کۆتایی سۆندەکە کە چارەسەری کونەکان بکەین، تۆش کاتێک هەستت دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتا لە بەرانبەر دەسگیرانەکەت کەپەیوەندی لەگەڵ ئەو کچانە ببڕیت کە بە ناشەرعی قسەیان لەگەڵ دەکەیت.
گەنجەکە بەو وەڵامە کرداریيە زۆر سەرسام بوو، بۆیە بڕیاریدا کە ئەو پەیوەندیانە بپچڕێنێت و پێچ و پەنا لە خۆشەویستیەکەیدا نەهێڵێ.

## دەمکوتکردنی جاحزی شاعیر

لە یەکێک لە کۆڵانەکانی بەغدا جاحزی گەورە شاعیر، ژنێک دەبینێ و توانجێکی لێدەدات و وەک ئاماژەیەک بۆ ناشیرینی ژنەکە دەڵێ:

- ﴿ وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ ﴾ [التكوير: ٥].

ژنەکەش زۆر خێرا وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ:

- ﴿ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُۥ... ﴾ [يس: ٧٨].

جاحزی سەری خۆی دادەخات و دەڕوات.

## من بە کەسانی وەک ئێوە دەجەنگم

پیاوێک لە پێشەوا عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) پرسی:

- بۆچی پێغەمبەری خودا (ﷺ) چووبایە هەر جەنگێک بەسەر دوژمندا زاڵ دەبوو و سەردەکەوت، بۆچی تۆ لە هەموو جەنگێکدا سەرکەوتوو نابیت؟

پێشەوا عەلی فەرمووی:

- ئاخر پێغەمبەری خودا (ﷺ) کەسانی وەک من و هاوشێوەی منی لەگەڵدابوو، بەڵام من کەسانی وەک تۆ و هاوشێوەی تۆم لەگەڵدایە.

## تەنها دەمت بکەرەوە

جارێکیان ژنێک لای پیاوێکی دانا زۆر ستایشی خۆی دەکرد، جا بۆئەوەی لای داناکەش کەمێ ستایشی خۆی بکات بە داناکەی وت:

- تۆ دەزانی کاتێک بە ڕێگادا دەڕۆم یان لە شوێنێک دادەنیشم پیاوێکی زۆر لە دەورم کۆ دەبنەوە، ئایا چی بکەم بۆ ئەوەی لە دەستیان ڕزگارم بێت؟

داناکەش وتی:
- زۆر ئاسانە، ئەوجارە ئەگەر لە دەورت کۆبوونەوە تەنها دووقسە بکە، ئەوسا ئەوانیش دەزانن کە تۆ تەنها جوانێکی بێ عەقڵی و وازت لێ دەهێنن.
ژنەکە زۆر توڕەبوو و کابرای دانای جێهێشت.

## بیشری پێخواس

بیشری پێخواس دەچێتە بەر دەرگای ماڵی موعافی کوڕی مەڕوان و لە دەرگای ماڵیان دەدات.
کچە بچۆکەڵەکەی موعافیش دەڵێ:
- کێیە؟
- بیشر: منم، بیشری پێخواس، هاتووم سەردانتان بکەم و سیلەی ڕەحم بەجێ بگەیەنم.
- کچەکەی موعافی: تۆ جارێ برۆ جوتێ پێڵاو بۆخۆت بکڕەو ئەو نازناوە لە خۆت بکەرەوە، ئینجا سیلەی ڕەحم بەجێ بگەیەنە.
بیشر دەڵێ:
- بەخوا تۆ ڕاست دەکەیت.

## وەڵامێکی حەسەنی کوڕی فەزل بۆ خەلیفە

حەسەنی کوڕی فەزڵ لەگەڵ کۆمەڵێ زانا و پیاوی دیار دەچێتە نێو دیوانی خەلیفە، دوای چەند خولەکێک دانیشتن، حەسەن ویستی دەست بە قسە بکات، خەلیفەش چاوی لێ زەق کردەوە و نەیهێشت قسە بکات، بەڵام دواتر حەسەن هەر نەوەستا و دەستی کرد بە قسەکردن، خەلیفەش لێی توڕەبوو و وتی:

- لە نێو ئەو هەموو کەسە بەتەمەنە تۆ قسە دەکەیت ئەی منداڵ؟

حەسەنیش وتی:

- جەنابی خەلیفە، نە من لە هود هود بچوکترم، نە تۆش لە پێغەمبەر سولەیمان (علیه السلام) گەورەتر، کاتێک هود هود بە سولەیمانی وت:

- ﴿...أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ ...﴾ [النمل: ٢٢].

دوای ئەوەش ئایا تۆ بێ ئاگای لەوەی کە پەروەردگار فەهم و تێگەیشتنی لەچەندین بوارێک بە سولەیمان داوە، خۆ ئەگەر بەتەمەن و گەورەیی بوایە ئەوا داود لە پێشتر بوو ئەو تێگەیشتنەی پێ بدرێ وەک دەفەرموێت:

- ﴿فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ ۚ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ ...﴾ [الأنبياء: ٧٩].

دوای ئەوە خەلیفە بە حەسەنی وت:

- قسە بکە بە خوا شیاوی ئەوەی قسە بکەیت.

## قەسەم بەخوا، هیچ ئەگەرێکی بۆ نەهێشتینەوە

گێردراوەتەوە لەسەر دەمی خەلیفە هیشام قاتی و قڕی ڕوو لە هەندێک گوند دەکات، خەڵکی گوندەکانیش کۆ دەبنەوە و پێکەوە دەچنە لای هیشام، منداڵێکیشان لەگەڵ بوو کە تەمەنی شازدە ساڵان بوو ناوی (دورواس) بوو، بەڵام زۆر زیرەک و لێهاتوو بوو، خاوەنی وەڵامی زۆر ژیرانە و دەمکوتکەر بوو.

کاتێک گەیشتنە لای هیشام هەموویان ڕازی بوون کە دورواس قسە بکات، کاتێک دەستی بە قسەکردن کرد هیشام وتی:

- باشە بۆ ئەو منداڵە قسە دەکات، کەسێکی بە تەمەنی قسە زانتان نیە؟

دورواسیش وەڵامی هیشامی دایەوە و وتی:

- جەنابی خەلیفە، قسەزانی و زمان پاراوی پەیوەندی بەتەمەنەوە نیە، ئێمە بۆ کێشەیەک هاتووین کە ڕەنگە ئێمەی منداڵ لە هەموان زیاتر گیرۆدەی ئەو کیشەیە بین.

هیشام بە زمان پاراوی و بوێری دورواس سەرسام بوو، بۆیە وتی:

- کەواتە تۆ قسە بکە.

ئینجا دورواس وتی:

- ئەی خەلیفەی موسڵمانان، ئێمە سێ ساڵە لە قاتیدا دەژین، وا سێ ساڵە چەوری و گۆشتی جەستەمان بەردەدات، ئەگەر ساڵێکی تر وا بڕوات ئەوا تەقە تەقی ئێسقانەکانیشی دێتە سەر، لە کاتێکدا ئێوە لە

ژیانێکی خۆش و پڕ لە ناز و نیعمەتدا دەژین، پارە و خواردەمەنیەکی زۆرتان لە ژێر دەست دایە، جا ئێمە بۆ ئەوە هاتووین، ئەگەر ئەوەی لە دەستتان دایە هی خودایە، ئەوا فەرموون بەسەر ئەو هەژارانەدا دابەشی بکەن، ئەگەر هی خۆیانە، ئێوە داگیرتان کردووە و بیگەڕێننەوە، ئەگەر هی خۆشتانە، لە ڕێگای خودا بیبەخشن و ژیانیان ڕزگار بکەن.

ئینجا هیشام ڕووی کردە دارودەستەکەی و وتی:

- قەسەم بەخوا، ئەو منداڵە هیچ ئەگەرێکی بۆ نەهێشتینەوە، دواتریش فەرمانی کرد کە پارە و خواردنێکی باشیان پێ بدەن، پاشانیش بە دورواسی وت:

- تۆ چیت دەوێ پێت ببەخشم؟

- دورواس: من هیچی تایبەتم بۆخۆم ناوێت، داواکاری من بۆ گشت موسڵمانانە.

## دەرفەت بدە، هۆکارەکەی دەزانی

دایکێک دوو سێوی لە دەست بوو، کورەکەی وتی:

- دایکە، سێوێکیان بە من دەدەیت؟

دایکەکەش یەکسەر پارچەیەکی بچوکی لەو سێوە کردەوە کە لە دەستی ڕاستی دابوو و خواردی، دواتر پارچەیەکی بچوکیشی لە سێوەکەی تر کردەوە و خواردی.

کوڕە زۆر بێ هیوا بوو، بە دایکی وت:

- بۆیە وات کرد تا هیچیان نەدەیت بەمن؟

دایکەکە زۆر بەپەرۆشیەوە یەکێک لە سێوەکانی بەرەو لای کوڕەکەی برد و پێی وت:

- فەرموو کوڕی شیرینم، چۆن پێت نادەم، بۆیە وامکرد تا بزانم کامەیان شیرینترە، فەرموو ئەوەیان شیرینترە با بۆتۆ بێت.

## کەر بۆ جێبەجێکردن ڕاسپێردراوە

فیلێک لە دارستان ڕایکرد، لێیان پرسی:

- چی بووە، ئەوە بۆچی ڕا دەکەیت؟

- وتی: چونکە شێر بڕیاری داوە سەرجەم زەڕافەکانی دارستان بکوژێت!

پێیان وت:

- جا خۆ تۆ فیلی نەوەک زەڕافە!

فیل وتی:

- دەزانم، بەڵام شێر کەری ڕاسپاردووە بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکە، کەریش خۆ نازانێ کێ فیلە و کێ زەڕافە.

# ئینتیما بۆ وڵات

کەسێک دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

ماوەیەک لە ئەڵمانیا بووم، ڕۆژێک بە هاوڕێکەمم وت:

- زۆر حەزم دەکرد سەردانی کۆمپانیای بێنز بکەم ، هاوڕێکەشم وتی:

- دەکەواتە وەرە با ئەمرۆ زوو بچین، چونکە سبەی کرێکارەکانی کۆمپانیای بێنز خۆپیشاندان دەکەن.

کاتێک چووین سەرنجم کەوتە سەر کرێکارێک بینیم زۆر بە جدیەوە کاری خۆی دەکات و برغووی دەزگایەکی توند دەکردەوە، زۆر لام سەیر بوو، بۆیە لێی چوومە پێشەوەو پێم وت:

- باشە ئەی ئێوە ناڕازی نین و سبەی خۆپیشاندان ناکەن بۆ ئاوا بە دڵسۆزیەوە کار دەکەیت؟

- وتی: تۆ ڕاست دەکەیت ئێمە ناڕازین، بەڵام ناڕازی بوونی ئێمە لە خاوەن کارەکەمانە کە مافەکانمان وەک پێویست نادات، بەڵام بەرهەمەکە بەرهەمی ئەڵمانیایە و بە ناوی ئەڵمانیا دەچێتە دەرەوە!

ئەو کەسە دەڵێت:

- ئەوسا نهێنی سەرکەوتنی ئەوانم زانی.

## بەڵام حەق گەورەترە

گێردراوەتەوە لە ئییاسی کوڕی موعاویە، کە جارێکیان ئییاس لەگەڵ پیرەمێردێک بە کێشە دێن و دەچنە لای دادوەر، ئییاس هەر زوو دەست بە قسەکردن دەکات و دەڵێ:

- جەنابی دادوەر، ئەو پیاوە ستەمی لێم کردووە و ماڵی منی زەوت کردووە.

دادوەریش دەڵێ:

- لەسەرخۆبە، ئەو پیرە پیاوە لەتۆ گەورەترە، قسەی وا لە دژی ئەو مەکە.

ئییاسیش دەڵێ:

- خودا جەنابی دادوەر سەلامەت بکات، بەڵام حەق لەتۆ و لە من و لەو پیاوەش گەورەترە.

- دادوەر: بێ دەنگبە، تۆ قسەی خێرت لە دەم نایەتە دەرەوە.

- ئییاس: لا إله إلا الله وحده لا شريك له.

دادوەر بێ دەنگ بوو.

کەسێک ئەو هەواڵە دەگەیەنێتە لای خەلیفە، خەلیفەش ئییاس دەکات بە دادوەر و دادوەری پێشووش لا دەدات.

## گفتۆکەیەکی نێوان کارتەر و جاکیشان

لەیەکێک لە فیلمەکانی ئەکتەری بەناوبانگ جاکیشان ئەم گفتوگۆیەی خوارەوە لە نێوان کارتەر و جاکیشان ڕوودات:

- کارتەر: جاکی تۆ چۆن هەمیشە ئارامی و هێمنی خۆت دەپارێزی؟

- جاکیشان: من چەلەحانێ لەگەڵ بێمێشک و گەمژەکان ناکەم، کاتێک ئەوان شتێکی حەق ناسەلمێنن دەڵێم: تۆ ڕاست دەکەی.

- کارتەر: بەڵام جاکی ئەمەی تۆ دەیکەی ڕەوا نییە و کوشتنی حەقە.

- جاکیشان: تۆ ڕاستەکەی.

## گفتوگۆی نێوان ژن و مێردێک

ژن و مێردێک درەنگانی شەو خەریک بوو دەخەوتن -پیاوەکە کە هیچی لە شەرعی خودا نەدەزانی، تەنها دەیزانی کە تا چوار ژن بۆ پیاو حەڵاڵ کراوە، بێ ئەوەی چۆنیەتیەکەی بزانێ- پیاوەکە بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن ژنەکەی ڕازی بکات تا ژنی دووەم بهێنێ، بیرۆکەیەکی بە مێشک داهات، بە ژنەکەی وت:

- ژنەکە دەزانی خالیدی کوڕی وەلید چەند جار ژنی هیناوە؟

- ژنەکە: ئەی تۆ دەزانی لە چەند غەزادا بەشدار کردووە؟

- پیاوەکە: جا ئەوە چ پەیوەندی بە پرسیارەکەی منەوە هەیە؟

- ژنەکە: دەزانم مەبەستت چییە، دەتەوێ ژنی دووەم بهێنی، تۆش بڕۆ نیو ئەوەندی خالیدی کوڕی وەلید بجەنگە حەزدەکەی چوار ژن بهێنە.

پیاوەکە بێ دەنگ بوو، لە دڵی خۆیدا وتی: بیرۆکەکەم فەشەلی هێنا.

دوای کەمێکی تر ژنەکە ڕووی تێکردەوە و وتی:

- ئێستا موسڵمانانی بۆرما و فەڵەستین دەچەوسێنەوە، بۆناچی لەوێ جیهاد بکەیت و ئەو واجبە گەورەیە ئەدا بکەیت، دواتریش بەتانیەکەی توند ڕاکێشاو لەخۆی وەرپێچا.

پیاوەکە لە خودای دەویست وەزعەکە بەوەندە کۆتایی بێت، بۆیە بێ دەنگ بوو.

هێندەی نەبرد، ژنەکە ڕووی تێکردەوە و وتی:

- کاکە مەچوو بۆ جیهادیش، بەڵام ئەوە جەژنی قوربان هات، خۆت سەری مەڕەکە ببڕە و بانگی قەساب مەکە، دەست و پێ سپی.

پیاوەکە هەر بێ دەنگ بوو، لە ناخی خۆی دەیوت: خۆزگە لاڵ بوومایە و ئەو قسەیەم نەکردبا.

ئینجا ژنەکە هەر بێدەنگ نەبوو، ئەوجارە بە پیاوەکەی وت:

- کاکە واز لە سەربڕینی مەڕەکەش بهێنە، وەرە ئەم بەیانیە بوێرە برۆ بۆ نوێژی بەیانی و بە جەماعەت نوێژەکەت ئەنجام بدە.

- پیاوەکە: دەبنوو بێ تامت کرد، ئەو قسانە لە کوێ دێنی؟

- ژنەکە: هیچ لە شەرعی خودا نازانی و باسی دوو سێ ژنیم بۆ دەکات.

دەڵێن: ئێستاشی لەگەڵدا بێت پیاوەکە ئەو بابەتەی باس نەکردۆتەوە.

## زۆری پێوەر نیە بۆ ڕاستیەتی!

ئەگەر لەگەڵ کەسێکدا گفتوگۆت کرد وتی:

ئاخر زۆرینەی خەڵک وان، یان زۆبەیان وا دەڵێن.

تۆ پێی بڵێ:

-ئەگەر لە قورئاندا بە دوای دەستەواژەی زۆرینەی خەڵک، یان زۆربەی کەسەکان بگەڕێی ئەمانـە دەبینـی:

﴿...أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ [الأنفال: ٣٤].

واتە: ((...زۆربەی ئەوانە نەفامن و نازانن)).

﴿...أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ﴾ [یونس: ٦٠].

واتە: ((...زۆربەیان ناسوپاسگوزار و بێ ئەمەکن)).

﴿...بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ [البقرة: ١٠٠].

واتە: ((...زۆربەی زۆریان باوەڕ ناهێنن)).

﴿...وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ [آل عمران: ١١٠].

واتە: ((...زۆربەیان گوناهبارو تاوانکارن)).

﴿...وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ﴾ [الأنعام: ١١١].

واته: ((...زۆربەیان نافامن و نازانن)).

﴿...وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴾ [المائدة: ١٠٣].

واته: ((...زۆربەشیان ژیر نابن)).

ئەگەریش بەدوای کەمینەکاندا بگەڕێی ئەمانە دەبینی:

﴿...وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴾ [سبأ: ١٣].

واته: ((..کەمێک لە بەندەکانم سوپاسگوزارن)).

﴿...وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٌ ﴾ [هود: ٤٠].

واته: ((...کەسیش بڕوای بەنوح نەکرد و لەگەڵیدا نەبوو، جگە لەکەسانێکی کەم نەبێت)).

﴿ وَقَلِيلٌ مِّنَ ٱلْأَخِرِينَ ﴾ [الواقعة: ١٤].

واته: ((دەستەیەکی کەمیشیان لەوانەن کەدواتر (بەشوێن ئەواندا ڕێبازی ئیمانیان گرتەبەر)).

کەواتە زۆری هەموو کات پێوەر نییە بۆ ڕاستی و دروستی شتەکان.

## ئەی بۆچی وا گێلن؟

پیاوێکی گەمژە بە پیرەپیاوێکی وت:

- باشە ئافرەتان بۆچی وا جوانن؟

پیرەپیاوەکە وتی:

- تا تۆ ئەوانت خوشبوێ.

- پیاوە گەمژەکە: ئەی بۆچی ئەوەندە گێل و نەفامن؟

- پیرەپیاوەکە: تا شکل و شێوەی پیاوێکی وەک تۆیان خۆشبوێت.

## ژن بە ژن لێی دەدرێت

کەسێکی دانا پیاوێکی بینی کە بە گۆچان لە ژنەکەی دەدا، پیاوە داناکە وتی:

- ئەی پیاو گۆچان بۆ ئاژەڵە، ژن بە ژن لێی دەدرێت (مەبەستی ئەوەبوو کە ژنێکی بەسەر بێنێت).

پیاوەکە وتی:

- لێت تێیناگەم ؟

ژنەکە کە لە پیاوەکە ئاقڵتر بوو زوو لە مەبەستی پیاوە داناکە تێگەیشت و بە پیاوەکەی وت:

- تۆ لەسەر لێدانی خۆت بەردەوامبە، واز لەم پیاوە شێتە بێنە، خۆشی نازانی چی دەڵێت.

## حەقیقەتی خۆشەویستی چییە و چۆنە؟

کچێک پرسیاری لە پیاوێکی دانا کرد و وتی:

- مامە حەقیقەتی خۆشەویستی چی یە و چۆنە؟

داناکەش وتی:

- برۆ بۆ باخچەیەک و جوانترین گوڵی باغەکەم بۆبێنە.

کچەکە چوو بۆ باخچەکە، بەڵام دوای ماوەیەک بە دەستی خاڵی گەڕایەوە و وتی:

- مامە جوانترین گوڵم دۆزیەوە، بەڵام ویستم بە شوێن گوڵێکی جوانتردا بگەڕێم، بۆیە گوڵە جوانەکەم جێهێشت، وتم ئەگەر هی جوانترم نەدۆزیەوە ئەوسا دێم ئەوە دەبەم، بەڵام کاتێک گەڕامەوە نەمابوو.

داناکە وتی:

- ئا ئەوە حەقیقەتی خۆشەویستیە کچەکەم، کاتێک لە نێو دەستتدایە نرخی نازانی، کاتێکیش ونی دەکەیت بۆی پەرۆش دەبیت و نرخی دەزانی.

## چ ڕەنگێک بوو؟

موقاتیلی کوڕی سولەیمان دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

جارێک کابرایەک کە زۆر خۆی پێ زانا و زیرەک بوو دەچێتە شوێنێک و دەڵێت:

- چیتان دەوێ، دەربارەی ئەوەی لەژێر عەرشە، تا ئەوەی لە بن خۆڵ و زەویشە لێم بپرسن تا وەڵامتان بدەمەوە!

پیاوێکیش لەوێ لێی هەڵدەستێتەوە و پێی دەڵێ:

- ناوالله، نەپرسیاری ئەوەی ژێر عەرشت لێدەکەین، نە ئەوەی لەژێر زەویش هەیە، بەڵکو پرسیارێکی سەر زەویت لێ دەکەین،

ئەویش ئەوەیە، تەنها پێمان بڵێ سەگەکەی یاوەرانی ئەشکەوت چ ڕەنگێک بوو؟

- کابرا نوقەی لێوە نەهات و ئەوێی جێهێشت.

## هەزار وەڵامی دەمکوتکەر

جاحیز دەڵێ:

- کابرایەکی ڕەزا گران هاتە لام و پێی وتم:

- زانیومە کە تۆ هەزار وەڵامی دەمکوتکەر دەزانی، منیش بۆیە هاتوومەتە لات تا چەند وەڵامێکم فێربکەیت.

جاحیزیش دەڵێ:

- بەسەرچاو، پێم بڵێ چیت دەوێ؟

- کابرا: ئەگەر کەسێک پێی وتم ڕەزا گران، من چی جواب بدەمەوە؟

- جاحیز: بڵێ ڕاست دەکەیت.

## بۆ ئەوە نەهاتووم فەتوام بۆ بدەیت

دەشتەکیەک دێتە لای مەئمون و پێی دەڵێ:

- من پیاوێکی دەشتەکیم.

مەئمونیش دەڵێ:

- هیچ شتێکی نامۆ لەوەدانیە.

- دەشتەکی: دەمەوێ بچم بۆ حەج.

- مەئمون: ڕێگای حەج فراوانە.

- دەشتەکی: بەڵام پارەی پێویستم نیە.

- مەئمون: کەواتە حەجت لەسەر نیە.
- دەشتەکی: ئەی پێشەوای بڕواداران، من هاتووم داوای یارمەتیت لێ بکەم، نەهاتووم فەتوام بۆ بدەیت.
مەئمون زۆر پێی پێدەکەنی و پارەی پێویستی دەداتێ بۆ حەج.

## خۆت سەرپشکبە

نوحی کوڕی باوکی مەریەم ویستی کچەکەی بەشو بدات، دراوسێیەکی هەبوو مەجوسی بوو، چوو پرس بەو بکات، کە ئاخۆ چۆن بە شوی بدات.
مەجوسیەکە پێی وت:
- خەڵک پرس بەتۆ دەکەن لە بەشودانی کچەکانیان، تۆش پرس بەمن دەکەیت؟
نوح: بەڵام دەبێ ڕێگایەکم هەر نیشان بدەیت.
کابرای مەجوسی وتی:
- سەرکردەی فارسەکان (کیسرا) بۆ بەشودانی کچەکانی پارە و سامانی دەکردە مەرج، سەرکردەی ڕۆمەکانیش جوانی و شۆخ و شەنگی کردبووە مەرج، سەرکردەی عەرەبەکانیش نەژاد و عەشیرەتیان دەکردە مەرج، سەرکردە و پێغەمبەرەکەشتان (محمد) دینداری کردۆتە مەرج، جا تۆش خۆت سەرپشکبە بە دوای ڕێبازی کامەیان دەکەویت.

## پرسیاری نەشیاو، پێویستی بە وەڵامی نەشیاوە

یەکێک لە دەسەڵاتدارە کۆنەکانی نەمسا زانیبووی کە لە ئیتاڵیا کەسێک هەیە زۆر شێوەی لە شێوەی ئەو دەچێت، بۆیە بانگهێشتی دەکات بۆ نەمسا، کاتێک کابرا دێتە لای ئەو دەسەڵاتدارە وەک سوکایەتیەک پێی دەڵێ:

- ئایا قەت دایکت لە ڤیەننا ژیاوە؟

کابراش زۆر خێرا وەڵامی دایەوە و وتی:

- نەواللە، بەڵام باوکم ماوەیەکی باش لە ڤیەننا ژیاوە.

کابرای دەسەڵاتدار سورهەڵگەڕا و زۆر توڕەبوو.

## زیاد وتن لە خێردا خێری تێدایە

کابرایەک بە ئییاسی کوڕی موعاویەی وت:

- تۆ ئەو عەیبەت هەیە زۆر قسە دەکەیت.

- ئییاس: ئایا قسەکانم باشن یان خراپ؟

- کابرا: باش و چاکن.

- ئییاس: کەواتە عەیبەکەی لە چی دایە، زۆر وتن لە خێردا خێری تێدایە.

## ئەو کاتەی هاوڕێکەتان هەستایەوە

دوو هاورێی ئەمەریکی دەچنە سەر گۆڕی یەکێک لە هاوڕێکەیان و تاجە گوڵێک لەسەر گۆڕەکەی دادەنێن.

کاتێک دەیانەوێ بڕۆن دەبینن لە نزیک گۆڕی هاوڕێکەیان گەنجێکی یابانی مستێک چەڵتوکی (برنج) پێیە و دەیەوێ لەسەر گۆڕی هاوڕێکەی بیچێنێ.

دوو هاورێ ئەمەریکیەکە سەیرێکی یەکتریان کرد و پێکەنین، لەبەینی خۆیاندا وتیان دیارە ئەو گەنجە زۆر تەواو نیە، وەرە با کەمێکی پێ ڕابوێرین.

پێکەوە چوونە لای و پێیان وت:

- ها گەنجی تێگەیشتوو، ئەوە کەی ئەو هاوڕێیەت بەتەمایە هەستێتەوە و ئەو برنجەی تۆ دەیچێنی بیخوات؟

گەنجە یابانیەکەش زۆر بە هێمنی وتی:

- ئەو کاتەی کە هاوڕێکەی ئێوە هەستایەوە و بۆنی تاجە گوڵەکەی ئێوەی کرد.

دەمیان کوت بوو و بەشەرمەزاریەوە ڕۆیشتن.

## بەتۆ کەرەکەم بیرهاتەوە

لوید جۆرج - سەرۆکی پێشووی بەریتانیا- لە کاتی بانگەشەی هەڵبژاردن قسەی بۆ هاوڵاتیان دەکرد، یەکێک لە ئامادەبووان کە دژی حیزبەکەی ئەو بوو هەستایەوە و ویستی لەبەردەم ئامادەبوان شەرمەزاری بکات، بە لویدی وت:

- ئەی لوید، کەر و عەرەبانەکەی باوکت بیرماوە؟ (وەک ئاماژەیەک بۆ ئەوەی کە تۆ چیت تا ببیت بە سەرۆک).

لویدیش زۆر هێمنانە وەڵامی دەداتەوە دەڵێ:

- ئەوەی ڕاستی بێت عەرەبانەکە تێک چوو و کەلکی کارکردنی نەما، بەڵام بەتۆ کەرەکەم بیرکەوتەوە، ئەویان هێشتا هەر ماوە.

ئامادەبووان دایانە قاقای پێکەنین و کابراش سەری شۆڕکرد.

## زانست لە کێ وەردەگیرێ؟

منداڵێک لە باوکی دەپرسێ:

- باوکە عیلم و زانست لە کێ وەردەگیرێ؟

باوکەکەش وتی:

- کوڕەکەم لە پیاوانێک کە، باشترینی وتەکان دەنووسنەوە، باشترینی ئەوەی کە نووسیویانەتەوە لەبەری دەکەن، باشترینی ئەوەش کە لەبەریان کردووە دەری دەبڕن.

## درۆ مەکە

باوکێک بە کوڕەکەی دەڵێ:

- کوڕم درۆ مەکە، درۆ کارێکی ناپەسەند و ناشیرینە...تۆ دەزانی ئەگەر درۆ بکەیت داهاتووت چی دەبێت؟

کوڕەکەش وتی:

- بەڵێ باوکە گیان دەزانم، دەبمە بەرپرسی بەشی ڕاگەیاندن و ڕیکلامی کۆمپانیاکەی تۆ.

## تۆ زۆر بە وتەکانت سەرسامیت

بە ئیباسی کوڕی موعاویەیان وت:

- بۆچی تۆ زۆر بە وتەکانی خۆت سەرسامیت؟

ئەویش وەڵامی دانەوە وتی:

- جا ئەگەر بە وتەکانم سەرسام نەبم چۆن دادوەری پێ دەکەم.

## وەڵامێکی عومەری کوڕی عبدالعزیز (خودا لێی ڕازی بێت)

بە پێشەوا عومەری کوڕی عبدالعزیزیان وت:

- بۆچوونی تۆ چییە لەسەر جەنگی جەمەل و جەنگی صەفین؟

وەڵامی دانەوە و وتی:

- ئەوە خوێنێک بوو خودای گەورە دەستی منی تێدا پاراست، جا چۆن زمانم دەخەمە ناوی.

## بۆچی بە ناوی خۆمەوە بانگم دەکەیت؟

کابرایەک بانگی خەلیفە مەئمون دەکات و دەڵێ:

- ئەی مەئمون (بێ ئەوەی کونیەکەی بڵێ).

مەئمونیش توڕە دەبێت و دەڵێ:

- بۆچی بە ناوی خۆمەوە بانگم دەکەیت و کونیەکەم نالێی.

پیاوەکە: ئەی مەئمون ئێمە کاتێک هاوار دەکەینە خوداش هەر ناوەکەی دەڵێین.

مەئموون بێ دەنگ بوو و پێداویستی کابرای جێبەجێ کرد.

## ئەوەی هەموو شت دەزانێ جێگای ئێرە نیە

جارێک مامۆستایەکی ئایینی لەسەر مینبەر ئامۆژگاری قوتابیەکانی دەکرد، یەکێکیش کە دژایەتی مامۆستاکەی دەکرد ویستی مامۆستاکە لەبەرامبەر قوتابیەکانی ئیحراج و شەرمەزار بکات، بۆیە پرسیارێکی لە مامۆستاکە کرد و وتی:

- ئەی مامۆستا تۆ مادام هێندە زیرەک و لیهاتووی پیمان بڵێ کە ئەو نیشانانەی لە نوشتە و جادوو بەکاردەهێنرێن لە چیەوە هاتوون؟

مامۆستاکەش هەر زوو وتی:

- نازانم.

کابرا بە مامۆستا پێکەنی و وتی:

- ئەی چۆن لەو شوێنە دادەنیشی و وتار دەدەیت و ئامۆژگاری خەڵک دەکەیت مادام هەموو شتێک نازانیت؟

مامۆستاکەش زۆر بە لەسەر خۆیی وتی:

- هاوار بۆتۆ ئەی پیاو، ئێرە شوێنی ئەو کەسانەیە کە هەموو شتێک نازانن، ئەوەی هەموو شتێک دەزانێ شوێنی ئێرە نیە.

کابرا سورهەڵگەڕا و ئەوێی جێهێشت.

## وەلامی حەکیمی یۆنان

بە سۆقراتیان وت:
- بۆچی تۆیان بە حەکیمترین کەسی یۆنان هەڵبژاردووە؟
سۆقراتیش دەستێکی بە ڕیشە درێژەکەی دادەهێنێ و دەڵێ:
- ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت کە من تاکە کەسبم، کە دەزانم دەربارەی هیچ شتێک زانستی تەواو نازانم.

## دەمەتەقێی دوو کۆرپەلە

ئەم دەمەتەقێیە دروستکراوە و وێکچواندنێکە بە ژیانی دونیا و زیندووبونەوە و وجودی پەروەردگار (نمونەی هەرە بەرزیش تەنها بۆ خودایە).

- کۆرپەڵەی یەکەم: تۆ بڕوات بە ژیانی دوای لەدایکبوون هەیە؟

-کۆرپەڵەی دووەم: بەڵێ بێگومان، پێم وایە ئەوێ شوێنێکە کە دەتوانین تیایدا ڕێ بکەین، لەوانەشە لەوێ بتوانین لە ڕێی دەمەوە شت بخۆین.

- یەکەم: شتی وا بە هیچ شێوەیەک ڕێی تێ ناچێت، ئێمە ئێستا هەردووکمان لە ڕێی پەتێکی باریکەوە (وێڵاش) خواردنمان پێ دەگات، خۆت دەبینی چەند کورتە، جا ئەگەر ئێمە بچینە دەرەوە ئەو پەتە چۆن دەمانگاتێ؟ واز لەوەش بهێنە، ئەگەر دنیایەکی دیکە جگە

لێره بوونی هەیه، بۆ تا ئێستا کەسێک لەوێوە نەگەڕاتەوە و بۆمانی باس بکات؟

- دووەم: لەوانەیە ڕۆژێک دابێت دایکمان ببینین.

- یەکەم: بۆ تۆ باوەڕت بە شتێک هەیە ناوی دایکمان بێت؟ ئەگەر شتی وا هەیە، کوا بۆ نایبینین؟

- دووەم: بە بڕوای من دایکمان لە گشت شوێنێکە، لە هەموو لایەکەوە دەوری داوین.

- یەکەم: من دایکم نابینم، کەواتە نییه.

- دووەم: ئەگەر بە ئارامی دابنیشیت و بێدەنگ بیت، گوێت لە دەنگی دەبێت، ئەگەر بەوردیش سەرنج بدەیت، هەست بە بوونی دەکەیت.

## نرخی بەهەشت

ڕۆژێک ئافرەتێک بە لای منداڵێکی غەمبارو دڵشکاودا تێپدەپەڕێ، بینی منداڵەکە خەریکی وێنەکێشانە لەسەر زەوی، ژنەکە دڵی زۆر بە منداڵەکە دەسوتێ و لێی نزیک دەبێتەوە و پرسیاری لێ دەکات:

- ئەی بچکۆڵ ئەوە خەریکی چیت؟

منداڵەکە وتی: خەریکم وێنەی بەهەشت دەکێشم و دابەشی دەکەم بۆ چەند بەشێک.

- ژنەکە زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

ئەی بچکۆڵ دەتوانی بەشێک لەو بەهەشتەم پێ بفرۆشی، نرخەکەی هەرچەندێک بێت پێتی دەدەم.

- منداڵەکە: بۆچی نا، بەشێک لەو بەهەشتەت بە بیست دینار پێ دەفرۆشم.

ژنەکە بیست دینار و هەندێک شیرینی دا بەمنداڵەکە و ڕۆیشت.

- ژنەکە شەو لە خەونیدا بینی هەر بەڕاستی چۆتە بەهەشت و بەشێکی فراوانی لە بەهەشت بۆ دیاری کراوە، بەیانی کە لەخەو هەستا خەونەکەی و ئەو چاکەیەی کە لەگەڵ منداڵەکەدا کردبووی بۆ مێردەکەی گێڕایەوە.

مێردەکەشی هەر ئەو بەیانیە بەپەلە خۆی گەیاندە لای منداڵەکە بۆ ئەوەی ئەویش بەشێک لەبەهەشتی لێ بکرێت.

پیاوەکە بەمنداڵەکەی وت:

- ئەی بچکۆڵ دەمەوێ بەشێک لە بەهەشتم پێ بفرۆشی نرخەکەی هەرچەندێک بێت پێتی دەدەم.

منداڵەکە: نایفرۆشم.

پیاوەکە بەسەرسوڕمانەوە وتی:

- بەڵام تۆ دوێنێ بە بیست دینار بەشێکت بە ژنەکەم فرۆشتبوو!

منداڵەکە: بەڵام ژنەکەت مەبەستی کڕینی بەهەشت نەبوو، بەڵکو ئەو تەنها بەزەیی بەمندا هاتەوە و ویستی لەو ڕێگەیەوە هاوکاریم بکات، بەڵام تۆ نیەتی هلوکاری کردنی منت نیە و تەنها دەتەوێ ئەوە بەدەست بهێنی کە دەتەوێ، نرخی بەهەشتیش بە پارە پێوانە ناکرێ.

پیاوەکە لە نهێنی خەونی ژنەکەی تێگەیشت و بە غەمباری ڕۆیشت.

## وەڵامێکی ژیرانە

ئەسمەعی شاعیر دەڵێ:
- جارێکیان ئافرەتێکی دەشتەکیم بینی کە زۆر جوان و بەرچاو بوو، بەڵام پێچەوانەی ئەو مێردەکەی تا بڵێی دزێو و ناشیرین بوو، منیش نەمتوانی خۆم ڕابگرم و لە ژنەکەم پرسی:
- ئەی ژن، تۆ بەو هەموو جوانیەت چۆن ڕازی بوویت ببیت بە هاوسەری ئەو پیاوە دزێوە؟
وەڵامی دامەوە و وتی:
- ئەی پیاو ئەوە کاری تۆ نیە و پەیوەندی بە تۆوە نیە، ڕەنگە ئەو پیاوەی من کارێکی باشی کردبێت و لە پاداشتدا خودای گەورە لە دونیادا منی بەو بەخشیبێ، یانیش ڕەنگە من خراپەیەکم کردبێت لە سزای ئەوە منی بەو بەخشیبێ، بۆیە لە هەردوو بارەکەدا من بە قەزای خودا ڕازیم.
ئەسمەعی دەڵێ: دەمم وشەی لێوە نەهاتە دەرەوە و ڕێی خۆم گرت و ڕۆیشتم.

## پێشەوا عەلی یان ئەبو بەکر؟

پیاوێکی سوننی و شیعی لەسەر فەزڵی پێشەوا ئەبو بەکر و عەلی (خودا لێیان ڕازی بێت) لێیان دەبێتە کێشە و هەر دووکیان ڕازی دەبن کە ئیبنو جەوزی دادوەریان بۆ بکات، کاتێک دەچنە لای و لێی دەپرسن:

- ئەی شێخ کامیان گەورەترە و فەزڵی زیاترە، پێشەوا عەلی یان پێشەوا ئەبو بەکر؟
ئیبنو جەوزیش دەڵێ:
- باشترینیان ئەوەیە کە کچەکەی لای ئەوە (مەبەستی پێغەمبەری خودا بوو (ﷺ)).
سوونیەکە وا لە وەڵامەکەی ئیبنو جەوزی تێگەیشت کە مەبەستی ئەوەیە کە کچی کەسەکە لای پێغەمبەری خودا بێت.
شیعەکەش وا تێگەیشت کە کچی پێغەمبەر لای کەسەکە بێت.
بەم وەڵامە شیعەکە وایزانی کە پێشەوا عەلی باشترە چونکە کچی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لای پێشەوا عەلییە، سونیەکەش وایزانی پێشەوا ئەبو بەکر باشترە، چونکە عائیشەی کچی پێشەوا ئەبو بەکر لای پێغەمبەری خودایە (ﷺ).
ئەگەرچی مشتومڕەکەیان نابەجێ بوو بەڵام وەڵامەکەی شێخ ئیبنو جەوزی هەر دووکیانی ڕازی کرد و خۆشی لە تەفزیل کردنی یەکێکیان بەسەر ئەوەی تردا پاراست.

## خۆ نەم وت سێ

لە شەوێکی زۆر تاریک، دوو هاوڕێ، کە یەکێکیان کوێر بوو دانیشتبوون و خورمایان دەخوارد.
کوێرەکە وتی:

- من هیچ نابینم، بەڵام لەعنەتی خودا لەوە بدات کە دوو دوو بخاتە دەمیەوە.
کاتێک تەواو بوون، دەنکە خورماکەی بەردەمی یەکتریان ژماردەوە تا بزانن کامەیان زیاتری خواردوون، بینیان دەنکی خورمای بەردەمی کوێرەکە سێ ئەوەندەی دەنکی خورمای چاوساغەکەیە!
چاوساغەکە بە تورەییەوە وتی:
- ئەوە چیە، بۆ دەنکە خورماکانی تۆ زیاترن؟ ئەی تۆ نەتوت لەعنەتی خودا لەوە بدات کە دوو دوو دەخاتە دەمیەوە؟
کابرای نابینا وتی:
- وایە تۆ ڕاست دەکەیت، بەڵام خۆ نەم وت لەعنەت لەوەبدات کە سێ سێ دەخاتە دەمیەوە.

## لە دۆزەخ ڕزگاری دەکات؟

مەجوسیەک دەمرێ و باوکی کۆمەڵێک قەرزی لەسەر دەبێت، هاوڕێکانی پیاوە مەجوسیەکە بە کوڕەکەی دەڵێن:
- برۆ خانوەکە بفرۆشە و قەرزەکانی باوکت بدەرەوە.
کوڕی مەجوسیەکەش دەڵێ:
- باشە ئەگەر من خانوەکە بفرۆشم و قەرزەکانی باوکم بدەمەوە، ئایا لە دۆزەخ ڕزگاری دەبێت و دەچێتە بەهەشت؟
- ئەوانیش دەڵێن: نەخێر.
کوڕەکە دەڵێ: کەواتە (دعه في النار، وأنا في الدار).

واتە: لێی گەڕێن با ئەو لە ئاگر دابێت و منیش لە خانوەکەم.

## کە تۆ دەبینم وا دەزانم شەیتان دەبینم

کەسێکی داخ لە دڵ بە دانایەکی وت:

- کەتۆ دەبینم وا دەزانم شەیتان دەبینم.

داناکەش زۆر بە هێمنی وەڵامی دایەوە و وتی:

- پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: ((**إذا سَمِعْتُم نُهَاقَ الحَمِيرِ فَتَعَوَّذوا باللّٰه مِنَ الشَّيْطان، فإنَّهَا رأتْ شَيْطاناً**)) واتە: ((هەرکات گوێ بیستی دەنگی کەر بوون، ئەوا پەنا بە خودا بگرن لە شەیتان، چونکە بەڕاستی ئەو شەیتانی بینیوە))، بەمەش بۆمان دەردەکەوێ کە کەر ئەو تایبەتمەندیەی پێ دراوە کە شەیتان ببینێ.

کابرا سور هەڵگەڕا و نوقەی لێبڕا.

## خودایە بیروباوەڕێکی وەک ئەو پیرەژنەم پێبدەی

ئەبو بەکری ڕازی یەکێکە لەو زانایانەی کە ماوەیەک بە زانستی فەلسەفە و گەردووناسیەوە خەریک بووە، جارێکیان دەچێتە نیسابور، لەوێ خەڵک لە دەوری کۆ دەبنەوە و گوێ بۆ وتەکانی دەگرن، کەمێک لەو لاترەوە پیرەژنێک وەستابوو، پیرەژنەکە لە گەنجێکی پرسی:

- ئەوە چییە ئەو خەڵکە لە دەوری کۆبونەوە؟

گەنجەکەش وتی:
- ئەوە ئەبو بەکری ڕازیە، زانایایەکی گەورەیە، (١٠٠٠) بەڵگەی لەسەر وجودیەتی خودا خستۆتە ڕوو.
پیرەژنەکەش وەڵامی گەنجەکەی دایەوە و وتی:
- دڵنیابە ئەگەر هەزار گومانی لە بونی خودا نەبووبێت ناتوانێ هەزار بەڵگە لەسەر بوونی ئەو بخاتە ڕوو.
ئەبو بەکر گوێی لەم قسەیە دەبێ و دەست بەرز دەکاتەوە و ودەڵێ:
- خودایە باوەڕێکی وەک ئەو پیرەژنە نیسابوریەم پێببەخشی.

## وەستان و ڕۆیشتن

پیاوێک پرسیار لە باوکی هوزەیل دەکات و دەڵێ:
- بەڵگەت چییە لەسەر دروست بوونی ئەم جیهانە؟
باوکی هوزەیلیش دەڵێ:
- وەستان و ڕۆیشتن بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەم جیهانە نەبووە و بونیات نراوە.
- پیاوەکە: بەڵگەکەت زۆر لاوازە، وەک ئەوە وایە بڵێی بەڵگە لەسەر ئەم جیهانە، هەر خودی جیهانە، تۆ پێویستە بەڵگەیەکم پێبدەیت لە غەیری ئەم جیهانە تا باوەڕت پێ بکەم.
باوکی هوزەیلیش زەردەخەنەیەک دەکات و دەڵێ:
- تۆ پرسیارێکم بۆ بێنە لە غەیری ئەم جیهانە، تا منیش بەڵگەیەکی غەیری ئەم جیهانەت پێ بدەم.

کابرا دەمکوت بوو.

## منیش شت بەدی دەهێنم

جارێکیان ئەبو حەنیفە لەگەڵ چەند بێ باوەڕێک لەسەر وجودیەت و خالقیەتی خودا دەبێتە مشتومڕی، ئەبو حەنیفە باسی ئەوەی دەکرد کە تەنها خودا بەدیهێنەر و دروستکاری ئەم کەون و گەردونەیە، یەکێک لە بێ باوەڕەکان قسەکانی بە پێشەوا بڕی و وتی:

- واتا تۆ پێت وایە تەنها خودا بەدیهێنەرە؟
- پێشەوا ئەبو حەنیفە: بەڵێ.
- بێ باوەڕ: منیش دەتوانم شت دروست بکەم و بۆشت دەسەلمێنم.
- ئەبو حەنیفە: واتا تۆ شت دروست دەکەیت؟
- بێ باوەڕ: بەڵێ، وەرە با بۆت بسەلمێنم.

بێ باوەڕەکە پێشەوای بردە لای کۆلکە دارێک و پارچە گۆشتێکی خستە نێو دارەکە و بە پێشەوای وت:

- دوای یەک مانگ لێرە یەکتر دەبینینەوە.
- ئەبو حەنیفە: باشە، من ڕازیم.

مانگێک تێپەڕی...

هەردووکیان بەیەکەوە چوونە سەر کۆلکە دارەکە، بینیان پارچە گۆشتەکە هەمووی بووە بە وردە کرمی سپی، بێ باوەڕەکە زۆر بە لە خۆباییانەوە وتی:

- فەرموو سەیربکە، بزانە گۆشتەکەم کرد بەچی، ئایا مانگێک پێش ئێستا ئەو کرمانە هەبوون؟

- ئەبو حەنیفە: بێگومان نەبوون.

- بێ باوەڕ: ئێستا باوەڕت بەوە هەیە کە منیش دەتوانم بەدیهێنەربم؟

- ئەبو حەنیفە: ئایا تۆ ئەوە دەزانی کە دروستکار زۆر باش ئاگاداری دروستکراوەکانیەتی؟

- بێ باوەڕ: بەڵێ، ئەی چۆن دروستکارە.

- ئەبو حەنیفە: کەواتە تۆ پێم بڵێ ژمارەی ئەو کرمانە چەندن؟

- بێ باوەڕ: نازانم!

- ئەبو حەنیفە: چەندیان نێرن چەندیان مێن؟

- بێ باوەڕ: نازانم!

- ئەبو حەنیفە: تەمەنیان چەندە و چەند دەژین و کەی دەمرن؟

- بێ باوەڕ: نازانم!

- ئەبو حەنیفە: باشە، کامەیان پێش هەموویان هاتە ژیان و کامەیان دواهەمین؟

- بێ باوەڕ: نازانم!

- ئەبو حەنیفە: کامەیان پێش هەموویان دەمرێ؟ کامەیان...؟

- بێ باوەڕ: نازانم!

- ئەبو حەنیفە: سبحان الله، واتە تۆ دروستکار و بەدیهێنەری و هیچ زانیارییەکیشت لەسەر دروستکراوەکانی خۆت نیە؟

کابرای بێ باوەڕ دەمکوت بوو و نوقەی لێوەنەهات.

## تۆ جوانی یوسفت هەیە

پیاوێک بە ژنێکی وت:

- تۆ وەک یوسف جوانیت؟

ژنەکەش دەیزانی ستایشکردن و پێهەڵدانی ئەو پیاوە تەنها قسەی سەر زمانیەتی و لە دڵەوەی نیە، وەڵامی دایەوە و وتی:

- فێڵەکانی تۆش هاوشێوەی فێڵی براکانی یوسفە.

## دادپەروەری یان ئازایەتی؟

لە ئەرستۆیان پرسی:

- بۆ پادشاکان دادپەروەری باشترە یان ئازایەتی؟

وەڵامی دانەوە و وتی:

- ئەگەر پادشا دادپەروەر بوو پێویستی بە ئازایەتی نیە.

## پیاوی متمانە پێکراو

کەسێک بە ئەحنەفی وت:

- پیاوێکی متمانە پێکراو سەبارەت بە تۆ هەواڵێکی خراپی پێداوم، ئایا ڕاستە؟

ئەحنەفیش پێی وت:

- پیاوی متمانە پێکراو بەخراپە باسی خەڵک ناکات.

## چەند وەڵامێکی ئەو کەسانەی کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان کردووە:

ئاشکرایە کە دوای وەفاتی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) بە دەیان کەس هاتوون بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان کردووە، جا لێرەدا چیرۆکی چەند کەسێک لەو کەسانە دەخەینەڕوو، کە چەندین وەڵامی جوان و وپەند ئامێز و پێکەنیناویان تێدایە.

جێگای ئاماژەدانە ئەو کەسانەی کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان کردووە بە گشتی دەبن بە دوو جۆر:

جۆرێکیان بانگەشەکەیان بە مەبەستی بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەکی دونیایی بووە، وەک: بەست هێنانی پارە، کەل و پەل، گەیشتن بە ئافرەت... جۆرێکیشیان بانگەشەکەیان لەگەمژەیی و بێ عەقڵی بووە، هەر ئارەزووی ئەوەیان کردووە کە خۆیان بهێننە ئاستی پێغەمبەران، کە ئەم جۆرەیان زیاتر و بڵاوتر بووە.

**ئەمەش چەند نموونەیەک:**

- بە عبداللەی کوڕی پێشەوا عەباسیان وت:

- موختاری کوڕی عوبەیدی سەقەفی بانگەشەی ئەوە دەکات کە وەحی بۆ هاتووە، ئایا تۆ چی دەڵێی؟

- عبدالله وتی: ڕاست دەکات.

- وتیان: چۆن؟

- وتی: خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿ هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴾ [الشعراء: ٢٢١ - ٢٢٢] واتە:
((هەواڵتان بدەمێ شەیتانەکان دادەبەزنە سەرکێ؟
دادەبەزنە سەر هەموو کەسێکی زۆر درۆزنی زۆر تاوانبار)).

- لە زەمانی خەلیفە مەئمون، کەسێک هاتە لای مەئمون و بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد.

مەئمونیش پێی وت:

- نیشانەی پێغەمبەرایەتی تۆ چییە؟

- کابرا: هەرچیت بوێ بۆت دەخەمە بەردەستان!

- مەئمون: دەی کە ئێستا وەرزی کاڵەک (گندۆرە)نیە تۆ تا کاتژمێرێکی تر کاڵەکێکمان بۆ بهێنە.

- کابرا: سێ ڕۆژ دەرفەتم بدە.

- مەئمون: نابێ، لەو کاتژمێرەدا دەمەوێ.

- کابرا: خێر بڵێ جەنابی خەلیفە، خودای گەورە زەوی و ئاسمانی بە شەش ڕۆژ دروست کردووە، بە سێ مانگ گندۆرە پێ دەگەیەنێت، کەچی تۆ سێ ڕۆژ چاوەڕێی من ناکەیت و دەتەوێ بە کاتژمێرێک بۆت بهێنم؟

مەئمون پێکەنی و خواردنی بۆ کابرا هێنا.

• هەر لەسەردەمی خەلافەتی مەئموندا پیاوێک بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات، مەئمونیش فەرمان دەکات کە بیهێنن بۆ کۆشک تا تەمبێی بکات، کاتێک هێنایان مەئمون لە کابرای پرسی:

- تۆچیت ئەی پیاو؟

- پیاوەکەش وتی:

- پێغەمبەر و نێردراوی ئەو زەمانەم!

- مەئمون: باشە نیشانە و موعجیزەی پێغەمبەرایەتی تۆ چییە؟

- پیاوەکە: من ئەو وردە بەردانە دەخەمە ناو ئاو و دەتوێنەوە.

مەئمون فەرمانی پێدەکات ئەو کارە بکات، ئەویش ئەنجامیدا، چۆنی وت وادەرچوو!

ئینجا مەئمون وتی:

- نابێت دیارە فێڵی تۆ لە بەردەکان دایە، ئێمە هەندێک وردە بەردی ترت پێدەدەین، ئەوان بخە ئاوەوە و با بتوێنەوە.

- کابرا وتی: ئێ خۆ ئێوە لە فیرعەون زاڵم تر نین، ئەو بەو هەموو زوڵمەیەوە بە فیرعەونی نەوت با گۆچانەکەت بۆ بگۆڕم بە گۆچانی ئێمە ئەو کارەت ئەنجام بدە.

مەئمون زۆر پێکەنی و کابرای ئیزندا.

- لەسەردەمی موعتەسەم پیاوێک بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، چووە لای موعتەسەم و پێی وت:
- ئەی موعتەسەم من پێغەمبەرم و دوام بکەوە.
- موعتەسەم: باشە، شاهیدی دەدەم کە تۆ ئەحمەق و گەمژەی.
- کابرا: منیش بۆ قەومێک نێردراوم کە وەک خۆمن.
موعتەسەم وازی لێهێنا و ئیزنیدا

- ژنێک لەسەردەمی مەئموندا بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات، مەئمونیش بانگهێشتی کۆشکی دەکات، کاتێک دەچێت لێی دەپرسێ:
- تۆ کێیت؟
- ژنەکە: من فاتیمەی پێغەمبەرم.
- مەئمون: ئایا باوەڕت بە پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) هەیە؟
- ژنەکە: بەڵێ، بێگومان.
- مەئمون: ئێ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ((لا نَبِيَّ بَعْدِي)) واتە: ((هیچ پێغەمبەرێک لە دوای من نیە)) ئەی بۆئەوە چی دەڵێی؟
- ژنەکە: ڕاستە، منیش گوێم لێبووە، بەڵام خۆ پێغەمبەر نەیفەرمووە (لا نَبِيَّةَ بَعْدِي)، ئەو فەرموودەیە بەس بۆ پیاوانە.

مەئموون بە پێکەنینەوە بە ئامادەبوانی وت:
- من هیچم پێنەما، ئێوە ئەگەر شتێکتان پێیە قسە بکەن.

• هەر لە سەردەمی مەئموون کابرایەکی ڕەش پێست هات و چووە کۆشکی مەئموون و بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد.
- مەئموون پێی وت: تۆ کێی؟
- کابرای ڕەش پێست: من موسای کوڕی عیمرانم.
- مەئموون: موسا کاتێک وەک موعجیزە دەستی لە گیرفانی دەرهێنا دەستی سپی بوو، تۆش دەستت بە سپیەتی لە گیرفانت دەربهێنە تا باوەڕت پێ بکەم.
- کابرای ڕەش پیست: بەڵام موسا ئەوەی وەک موعجیزە پیشانی فیرعەوندا، ئەگەرنا موسا خۆی ڕەش پێستە.
مەئموون زۆری پێکەنی و لەگەڵیدا دەستی بە گاڵتەکردن کرد.

• لەسەردەمی واسق (الواثق) پیاوێک بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، ڕۆژێکیان چووە لای واسق و وتی:
- من پێغەمبەر موسام.
واسقیش لەو کاتەدا جۆرکە ئاوێکی لا بوو، وتی:
- دە کەواتە وەرە گۆچانێک لەو جۆڕکە ئاوە بدە و بیکە بە کانی.

- کابرا وتی: تۆش وەک فیرعەون بڵێ: (من خودای هەرە بەرزی ئێوەم)، ئەوسا منیش ئەوەت بۆ دەکەم.

- لەسەردەمی یەکێک لە خەلیفەکان کەسێک بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات، خەلیفەش بانگهێشتی دەکات و لێی دەپرسێ:

- نیشانەی پێغەمبەرایەتی تۆ چییە؟

کابراش دەڵێ:

- من دەزانم چی لە دەروونی تۆدا هەیە!

- خەلیفە: دەی کەواتە بڵێ چی لە دەروونی مندا هەیە؟

- کابرا: تۆ لە دەروونی خۆتدا پێت وایە من درۆزنم.

- خەلیفە: ڕاست دەکەیت.

خەلیفە فەرمانی کرد کە بیخەنە زیندانەوە، چەند ڕۆژێک لە زیندان بوو، دواتر خەلیفە وتی برۆن بیهێنن، کاتێ هێنایان خەلیفە لێی پرسی:

- ها ئەو چەند ڕۆژەی لەزیندان بوویت هیچ وەحیت بۆ نەهاتووە؟

- کابرا: نەخێر.

- خەلیفە: بۆچی؟

- کابرا: چونکە فریشتەکان ناچنە زیندانەکانەوە!

خەلیفە پێکەنی و ئازادی کرد.

• لەسەردەمی مەئمون کابرایەکی تر بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، مەئمونیش فەرمان دەکات دەستگیری بکەن و بیبەن بۆ کۆشک، کاتێک دەیبەن مەئمون لێی دەپرسێ:

- تۆ پێغەمبەری؟

- کابرا: بەڵێ.

- مەئمون: باشە موعجیزەی تۆ چییە؟

- کابرا: چیت دەوێ لێم داوا بکە، من جێبەجێی دەکەم.

مەئمونیش لەو کاتەدا قفڵ و کلیلێکی لێ نزیک بوو، قفڵەکەی قفڵدا و کلیلەکەی لێ دەرهێنا و دایە دەستی کابرا، پێی وت:

- ها ئەو قفڵەم بە بێ کلیل بۆ بکەرەوە.

- کابراش وتی: جەنابی خەلیفە، من پێغەمبەرم نەک حەداد!

مەئمون زۆر پێی پێکەنی و ئازادی کرد.

## چەند وەڵامێکی پێشەوا ئەبوبەکر باقلانی:

پێشەوا ئەبوبەکر باقلانی لە ساڵی لە ساڵی (٣٣٨ كۆچی) لە شاری بەسرە لەدایک بووە، لە ساڵی (٤٠٣) وەفاتی کردوە، باقلانی کەسێکی زمان پاراو و وەڵام خێرابووە، هەمیشە وەڵامی ئامادەبووە، بەتایبەتیش لە بەرامبەر ناحەزانی ئیسلام، هەر کەسێک بەرامبەری وەستابێ و قسەی پێ وتبێ، باقلانی بێ دەنگ و دەمکوتی کردووە، لەبەرگی یەکەمی ئەم کتێبەش چەند وەڵامێکی ئەو پیاوە بەڕێزەمان خستەڕوو، لەبەرگەش بە ویستی خودا چەند نموونەیەکی تر لە وەڵامەکانی دەخەینەڕوو:

- یەهوودییەک بە باقلانی دەڵێت:

- ئێوە زۆر خۆپەرست و عونسوڕین.

باقلانییش دەڵێ:

- بەڵگەت لەسەر ئەو قسەیە چییە؟

- کابرای یەهوودی: چونکە کچانی ئێمە و نەسڕانیەکان بۆ خۆتان بە حەڵاڵ دەزانن، کەچی ئێوە کچەکانی خۆتان نادەن بە ئێمە.

باقلانیش دەڵێ:

- ئێمە باوەڕمان بە پێغەمبەرەکەی ئێوە (موسی) (علیه السلام) هێناوە، باوەڕیشمان بە پێغەمبەری نەسڕانیەکان (عیسی) (علیه السلام) هێناوە، بۆیە ڕاوایە بۆمان کە

کچەکانی ئێوە لە خۆمان مارەبکەین، دە وەرە تۆش باوەڕ بە پێغەمبەرەکەی ئێمە بهێنە تا کچانی ئێمەش بۆتۆ حەڵاڵ بن.
کابرا بێ دەنگ بوو و نوقەی لێبرا.

• لەساڵی ٣٧١ پادشای عێراق بە مەبەستی گفتوگۆیەک لەگەڵ نەسرانیەکان باقلانی دەنێرێت بۆ قوستەنتەنیە.
کاتێک پادشای ڕۆم هەواڵی هاتنی باقلانی پێ دەگات، فەرمان بە دار و دەستەکەی دەکات کە دەرگای هاتنەژوورەوەکەی بۆ کورت بکەنەوە، تاوەکو باقلانی ناچار بێت سەری خۆی دابنوێنێ و بەشێوەی ڕکوع بۆلای پادشا بچێتە ژوورەوە.
کاتێک باقلانی لە ژووری پادشا نزیک بوویەوە، زانی شتەکە ئاسایی نیە، چونکە دەرگای پادشاکان هەمیشە گەورەیە، زانی کە ئەمە پیلانێکە لە دژی ئەو، بۆیە کاتێک نزیک دەرگاکە بویەوە خۆی سوڕاند و پشتا و پشت بەرەو لای پادشا چوو.
پادشا سور هەڵگەڕا و زانی هیچی پێ لەگەڵ باقلانی ناکرێت.

• هەر لە هەمان سەردانی بۆ لای پادشای ڕۆم، پادشا چەند پرسیارێکی لێ دەکات:
- پادشا: ئایا پێغەمبەرەکەی ئێوە شەڕی کردووە؟

- باقلانی: بەڵێ.
- پادشا: ئایا قەت لە پێشەوەی شەڕەکان بووە؟
- باقلانی: بەڵێ.
- پادشا: ئایا سەرکەوتوو بووە؟
- باقلانی: بەڵێ.
- پادشا: ئایا هیچ جار هەبووە لە جەنگ سەرنەکەوێ؟
- باقلانی: بەڵێ.
- پادشا: سەیرە! پێغەمبەرە و سەرناکەوێ؟
- باقلانی: بۆ سەیرە؟ کەسی واهەیە کوڕی خودایە و لە سەلیب دراوە (ئەمە وەک توانجێک بوو بۆ نەسڕانیەکان کە دەڵێن: عیسی کوڕی خودایە و لە سەلیب دراوە).
پادشا زۆر بەو قسەیە تێکچوو، هیچی لەبەرامبەر باقلانی پێنەما.

• بەتریکێکی -پیاوی ئاینی- نەسڕانیپرسیاری لە باقلانی کرد:
- ئایا ئەوە ڕاستە کە مانگ بۆ پێغەمبەرەکەی ئێوە شەق و لەت کراوە؟
باقلانیش وتی:
- گومان لەوەدا نیە.
- بەتریکەکە وتی: ئەی بۆ کەس لە ئەهلی مەککە نەیبینی؟

ئینجا باقلانی بێ ئەوەی وەڵامی ئەو پرسیارەی بداتەوە بە کابرای نەسرانی وت:

- ئایا ڕاستە سفرە و خوان بۆ سەر پێغەمبەر عیسا (علیە السلام) دابەزیوە؟

کابرای نەسرانیش وتی:

- بەڵێ گومان لەوەدا نیە.

- باقلانی: ئەی بۆچی کەس نەیبینیوە؟

کابرای بەتریک بێ دەنگ بوو.

دواتر باقلانی پێی وت: ئێمە باوەڕمان بە هەردووکیان هەیە، هەم بە لەت بوونی مانگەکە و هەمیش بە دابەزینی خوانەکە، چونکە هەر دووکیان پەروەردگاری مەزن هەواڵی پێداوین.

- هەر لەگەڵ هەمان بەتریکی پێشوو، بەتریکەکە دەست دەکاتەوە بەقسەکردن و دەڵێ:

- پێغەمبەری ئێمە (عیسی) (علیە السلام) زۆر لە پێغەمبەرەکەی ئێوە پاکترە؟

- باقلانیش دەڵێ: بۆ؟

- بەتریک: چونکە پێغەمبەرەکەی ئێوە هاوسەرگیری کردووە و ئەوەی ئێمە نەیکردووە.

باقلانیش دەڵێ:

- ئایا تۆ هاوسەرگیریت کردووە؟

- بەتریک: نەخێر، چونکە هاوسەرگیری کارێکی پیسە و ئێمە لەو دونیایەدا ئەو کارە ناکەین.

باقلانیش پێی دەڵێ:

- ئێ خۆ ئێوە دەڵێن خودا کوڕی هەیە و هاوسەرگیری کردووە، ئایا ئێوە لە خودا پاکترن؟

بەتریکەکە دەڵێ: قەسەم بەخوا، تۆ ڕاست دەکەیت ئەی باقلانی.

## چەند وەڵامێکی جوان و دەمکوتکەری بالول:

• وتیان بالول زەماوەندە.

- وتی بەمن چی!

- وتیان زەماوەندی تۆیە.

- بەئێوە چی.

• دەگێڕنەوە جارێکیان کەسێکی خانەدان بانگی بالول دەکات و پێی دەڵێت:

- بالول تۆ تا ئێستا لەخۆت (کەر)ترت بینیوە؟

- بالولیش خێرا دەڵێ:

- ناوەڵا قوربان گیان، ئەوە یەکەم جارمە بیبینم.

• ڕۆژێک دارۆغا بە بالولی وت:

- بالول من تا ماوەیەک دەچم بۆ شارێکی تر، لە ئێستاوە خوا حافیزیتان لێ دەکەم.

- بالولیش دەڵێ: ئەمە کارەساتێکی گەورەیە!

دارۆغا پرسی:

- بۆ ئێوە؟

- بالول: نا، بۆ خەڵکی شارەکەی تر!

- ڕۆژێک کابرایەکی دەوڵەمەند لە بالولی پرسی:

- ئایا لە نێوان من و تۆدا هیچ جیاوازییەک ئەبینیت؟

بالول وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ هەردوکمان شتێکی خاڵی و شتێکی پڕمان هەیە ئەویش ئەوەیە: گیرفانی تۆ پڕەو هی من خاڵی، مێشکی تۆ خاڵی و هی منیش پڕ.

- ڕۆژێکیان بالول لەگەڵ خەلیفە هارون ڕەشید دەچێت بۆ گەرماو، خەلیفە بەگاڵتەوە بە بالولی وت:

- بالول ئەگەر من خزمەتکار و غوڵام بومایە چەند پارەم دەکرد؟

- بالول: گوتی: پەنجا دینار.

- خەلیفە توڕە بوو و وتی:

- شێتە تەنها ئەو خاولیەی کەلەسەر شانمە نرخەکەی پەنجا دینارە!!

- بالولیش وتی: قوربان گیان منیش تەنها نرخم بۆ خاولیەکەت داناوە، ئەگەرنا خەلیفە هیچ سوودێکی نیە و هیچ ناکات.

• ڕۆژێک هارونه ڕەشید بڕێک پارەی دا بە بالول تا لە نێوان هەژاراندا بیبەخشێتەوە، بالول پارەکەی لە خەلیفە وەرگرت و پاش ماوەیەک دایەوە بە خەلیفە!

- هارون پرسی: ئەوە چییە بالول بۆ پارەکەت هێناوەتەوە؟

- بالول وتی: قوربان هەرچەند بیرم کردەوە لە تۆ هەژارترم نەبینی، لەبەر ئەوە وتم با پارەکە بدەمەوە بەخەلیفە، چونکە دەبینم کارمەندەکانی تۆ بەزۆر باج و سەرانە لە دوکاندارەکان دەستێنن و لێیان دەدەن، پاشان پارەکە دەهێنن بۆ خەزێنەکەی تۆ، کەواتە تۆ لەهەموو کەسێ زیاتر پێویستت بەو پارەیە!

• ڕۆژێک بالول لە گۆڕستان دانیشتبوو، خەلیفە بەوێدا تێپەڕی، چاوی بە بالول کەوت و لێی پرسی:

- بالول ئەوە بۆ نایەیتەوە بۆ شار؟

- بالول وتی: ئەی ئەوانەی شار بۆ کوێ دەچن؟

- خەلیفە: دێن بۆ ئێرە.

- بالول: کەواتە ئێرە شارە!

- خەلیفە وتی: بەخوا بالول شێتی و قسەی ژیرانەش دەکەیت.

- بالول: ئەگەر شێت بوومایە ئەو ژیانەی خۆم دەگۆڕییەوە بە ژیانەکەی تۆ.

• جارێکیان بازرگانێکی بەغدادی لەگەڵ کۆیلەکەی لە ناو کەشتیەک دانیشتبوون، کەشتیەکە بەرەو بەسرا دەڕۆیشت، بالول و چەند کەسێکی تریش لەو کەشتیەدا بوون.
کاتێک کەمێک ڕۆیشتن و گەیشتنە قوڵایی دەریاکە کۆیلەکە لە ترسی شەپۆلەکان دەستی کرد بە گریان.
سەرجەم سەرنشینانی کەشتیەکە بەو حاڵەتەی کۆیلەکە بێزار و بێتاقەت بووبوون.
بالولیش دەچێتە لای خاوەنی کۆیلەکە و ئیزنی لێوەردەگرێ تا وانەیەک فێری ئەو کۆیلەیە بکات، ئەویش ڕازی دەبێت.
هەرزوو بالول داوایکرد کە کۆیلەکە فڕێبدەنە ناو دەریاکەوە، داواکەی جێبەجێ کرا، کاتێ کۆیلەکە خەریک بوو بخنکێت و بمرێت، ڕزگاریان کرد، ئیتر دوای ئەو حاڵە کۆیلەکە زۆر بە بێدەنگی لە سوچێکی کەشتیەکەوە دانیشت و نوقەی لێوە نەدەهات.
سەرنشینەکان پرسیاریان لە بەهلول کرد:
- چۆن زانیت بەم کارە ئەو کۆیلەیە بێ دەنگ دەبێت؟
بالول: ئەو کۆیلەیە نەیدەزانی ئەم کەشتیە چەند ئارامە و لە هێمنی و گرنگی ئەم کەشتیە تێ نەدەگەیشت، کاتێ فڕێدرایە ناو دەریاکەوە، ئەوسا تێگەیشت کە ناو کەشتیەکە چەندە

خۆش و ئارامە، کاتێکیش کە هێنامانە دەرەوە قەدری کەشتیەکەی بۆ دەرکەوت و بێ دەنگ بوو.

• گێردراوەتەوە کە جارێکیان بالول دیرهەمێک لای هارونە ڕەشید دادەنێت، بەو مەرجەی هەر کات بیەوێتەوە هارون خێرا ئەو دیرهەمەی بداتەوە.

هارونیش دەڵێ دیرهەمێ چییە، هەر کات بیەوێ لە جیاتی دیرهەمێ سەد دیرهەمی دەدەمێ.

ڕۆژێک هارونە ڕەشید لە گەرماو دەبێت و خەریکی خۆ شوشتنە، لەو کاتەدا بالول دێت و دەرگای گەرماوی لێدەگرێ دەڵێ:

- ئەی هارون زووکە ئەو دیرهەمەم بدەرەوە.

- هارون: باشە با بێمە دەرەوە.

- بالول: نەخێر هەر ئێستا دەمەوێتەوە، ئەی ڕێککەوتنەکەمان وانەبوو کە هەر کات ئەو دیرهەمەم بوێتەوە تۆ خێرا پێم بدەیتەوە؟

- هارون: بەڵێ وابوو، بەڵام بەس با بێمە دەرەوە، لە جیاتی دیرهەمێک سەد دیرهەمت دەدەمێ.

- بالول: نەخێر، هەر ئێستا دیرهەمی خۆم دەوێتەوە.

- هارون: کورە ئەی هاوار، من ئێستا ڕووت و قوتم، یەک قروشم پێ نیە، دیرهەمی تۆ لە کوێ بێنم؟

- بالول: دە کەواتە بزانە ئەی هارون، لە ڕۆژی حەشریشدا ئاوا ڕووت و قوت دەبی و خەڵکیش داوای حەقی خۆیان لە تۆ دەکەن، تۆش هیچت پێ نیە بیاندەیتەوە، بۆیە لە خودا بترسە و مافی کەس لەسەر خۆت مەهێڵەوە.
- هارون: بەڕاستی لە گەرماویش من فێری وانە و پەند دەکەیت ئەی بالول.

ڕۆژێک بازرگانێک دەچێتە لای بالول و لێی دەپرسێت:
-ئەی بالولی ژیر و دانا بە بۆچوونی تۆ ئەمساڵ چ کەل و پەلێک بکڕم بۆ ئەوەی قازانجێکی زۆر بکەم و پارەیەکی باشم دەستکەوێت؟
بالول لە وەڵامدا وتی:
- بڕۆ ئاسن و لۆکە بکڕە، کابرای بازرگانیش بەقسەی بالولی کرد و قازانجێکی زۆری کرد.
بۆ ساڵی داهاتوو هەمان بازرگان هاتەوە بۆ لای بالول، بەڵام ئەمجارە بە فیز و تەکەبورێکەوە بە بالولی وت:
- ها بالولە شێت! پارساڵ بەهۆی تۆوە قازانجێکی باشم کرد، ئەمساڵیش شتێکم پێ بڵێ بزانم ئەمجارەشیان قازانجێکی وا ناکەمەوە.

- بالول وتی: برۆ پیازو کاڵەک بکڕە، کابرا ئەوساڵە بڕێکی زۆر پیاز و کاڵەکی کڕی، بەڵام هەر زوو پیاز و کاڵەکەکە ڕزین و تێداچوون.

بازرگانەکە زەرەرێکی زۆری کرد، بە تورەیی هاتەوە بۆ لای بالول و پێی وت:

- هەی شێتی گەمژەماڵت کاول کردم هەموو سەروەتەکەمت بە با دا، خەتای خۆمە بۆچوونی شێتێکی وەک تۆ وەردەگرم.

بالول پێی وت:

- لەسەرخۆبە ئەی پیاو، جەنابت یەکەم جار کە هاتی وەک ئەوەی پرس بە زانایەک بکەیت پرست پێکردم، منیش وەک زانایەک جوابم دایەوە، بەڵام جاری دووەم کە هاتی وەک شێت و گەمژە سەیری منت کرد، بۆیە منیش وەکو شێتێک وەڵامم دایەوە.

کابرا زانی کە وەک پێویست ڕێزی لە بالول نەگرتووە و داوای لێبوردنی لە بالول کرد.

- یەکێکی تر لە بەسەرهاتە ناوازەکانی بالول، گێڕدراوەتەوە کە جارێکیان چەند بازرگانێک دەچن بۆ بە جێگەیاندنی فەریزەی حەج، یەکێک لە بازرگانەکان خاوەنی بڕێک زێڕ بوو، زێڕەکە بە ئەمانەت لای دادوەر جێدەهێڵێت، کاتێک گەڕانەوە

بازرگانەکە دەچێتە لای دادوەر و داوای ئەمانەتەکەی دەکاتەوە، دادوەرەکەش دەڵێ:

- دوو مشک زێڕەکەتیان خوارد!

- بازرگانەکەش دەست دەکات بە گریان، لەو کاتەدا بالول بەوێدا ڕەت دەبێت، لە بازرگانەکە دەپرسێ:

- ئەوە بۆچی دەگریەیت؟

- بازرگانەکە: حال و بەسەرهاتی خۆی بۆ بالول گێڕایەوە.

بالول بە بازرگانەکەی وت:

مەگریە، من ئەو زێڕەت بۆ وەردەگرمەوە.

هەر ئەو کات بالول بەخێرایی دەچێت بۆ لای هاڕونە ڕەشید و دەڵێ:

- فڵانت کردووە بە والی فڵانە شتە، فڵانیش والی ئەو شتە و ئەوی تریان بەرپرسی فڵانە شوێنە.

هاڕون لێی پرسی:

- وایە، باشە تۆ چیت دەوێ.

بالول: منیش دەمەوێ بمکەیت بە بەرپرسی مشک و جورجان.

- هاڕونە ڕەشیدیش وتی: باشە تۆ لە ئێستاوە بەرپرسی مشک و جورجانیت.

- بالول: نەخێر ئاوا نابێت، دەبێت مەرسومێکی فەرمی پێ دەربکەیت و حەسانەشم پێ بدەیت. هارونیش مەرسومی بۆ دەرکرد و ئەوەی پێ ویستی بوو پێیدا.

بالول چووە دەرەوە و دەستی کرد بە هات و هاوار و دەنگی خۆی هەڵدەبڕی و دەیوت:

- ئەی خەڵکینە لەم ڕۆوە من بەرپرسی هەموو مشک و جورجێکم. هەرچی منداڵ هەبوو هەمووی دوای کەوتبون و بە بالول پێدەکەنین، تا گەیشتنە بەر دەرگای ماڵی دادوەر.

لەگەڵ دەنگە دەنگ دادوەر هاتە دەرەوەو وتی:

- ها ئەوە چیتە بالول، ئەو هەرایە چییە دروستت کردووە.

- بالول: جەنابی دادوەر خۆت ئاگاداری من بە مەڕسومی خەلیفە کراوم بە بەرپرسی هەموو مشک و جورجێک، جا دەمێک پێش ئێستا مشکێک هاتوو لیرەیەکی منی خوارد و دواتریش خۆی خستە نێو ژێر دیواری ماڵەکەی تۆ، ئێستا هاتووم دەستگیری بکەم و سزای بدەم!

- دادوەر: -بە پێکەنینەوە- جا چۆن مشک لیرە دەخوات ئەی بالول؟

- بالول: با با دەیخوات، هەروەکو چۆن دوو مشکەکە ئەو زێڕەیان خوارد کە بە ئەمانەت لای تۆ بوو، جا یان ئەوەتا ئەو زێڕە دەگەڕێنیتەوە بۆ خاوەنی، یانیش من ئەو دیوارە دەڕوخێنم کە مشکەکەی چۆتە ژێرەوە.

دادوەر بە ناچاری زێڕەکەی بۆ بازرگانەکە گەڕاندەوە.

• ڕۆژێک بالول لە بازاڕ پیاسەی دەکرد، لەناکاو کابرایەک لەپشتەوە زللەیەک دەکێشێ بە پشتەملیدا، بالولیش ئاوڕ دەداتەوە و دەیەوێت بیکات بەشەڕ لەگەڵ کابرا، کابرا زۆر داوای لێبوردن دەکات و دەڵێت:

- ببورە قوربان، بڕوا بکە وامزانی کەسێکی ناسیاوی خۆمانی.

بەڵام بالول بەم بیانووە ڕازی نەبوو و دڵی ئاوی نەخواردەوە، بۆیە سور دەبێ لەسەر ئەوەی کە بچنە بەردەم دادوەر، پاش ئەوەی دەچنە بەردەم دادوەر، بە قەدەر دادوەر خزمی کابرا دەردەچێت، دوای گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە دادوەر چاوێک لە کابرا دادەگرێت - وەک ئاماژەیەک بۆئەوەی کە خەمت نەبێت دەربازت دەکەم- دواتر دادوەر بڕیاریدا کە کابرا (٢٠) دینار بداتە بالول لەبەرامبەر زللەکەدا، پاشانیش کابرا دەڵێت:

- قوربان جەنابی دادوەر، من ئێستا (٢٠) دینارم پێ نیە، چی بکەم؟

دادوەریش چاوێکی تری لێ دادەگرێت و دەڵێ:

- برۆ بیهێنە، بالول تۆش لێرە لای من بمێنەوە تا دەگەڕێتەوە.

کابرا ڕۆیشت و بالولیش دانیشت و چاوەڕوانی کابرای دەکرد، بەڵام زۆری پێچوو کابرا هەر نەگەڕایەوە، ئا لەوکاتەدا بالول بیری کردەوە و لە فێڵەکەیان تێگەیشت، هەستایەوە و بەرەو ڕووی دادوەر چوو، کاتێک لە دادوەر نزیک بوویەوە، زللەیەکی توندی لە بناگوێی دادوەر سرەواند و میزەرەکەی سەری پەڕاند، دواتریش بە دادوەری وت:

جەنابی دادوەر، هەر کات کابرا گەڕایەوە (٢٠) دینارەکەی هێنا، ئەوا بۆ خۆتی هەڵبگرە لەبەرامبەر ئەو زللەیە، مادام سزای زللەیەک تەنها (٢٠) دینارە وەک شیری دایکت پێت حەلاڵت بێت.

## چەند وەڵامێک بۆ پرسیاری گەمژەکان:

لەم بەشەدا چەند وەڵامی گەمژانەتان نیشان دەدەین، کە ڕەنگە زۆر جار ببنە وەڵامی دەمکوتکەریش بۆ کەسە گەمژەکان، یانیش بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ گاڵتە بە ئاست و عەقڵی تۆ بکەن.

ڕەنگە هەندێک جار بۆ شکاندنەوەی تۆ لە نێو کۆمەڵە هاورێیەکی تایبەتی خۆت، یەکێ لە هاوڕێکانت یەکێک لەو جۆرە پرسیارانەت لێ بکات، لەم بارەدا ئەگەر تۆ بە جدی و بە چاکی وەڵامی دروستی ئەو کەسە بدەیتەوە ڕەنگە ببیتە جێگای پێکەنین بۆ پرسیارکەر و ئامادەبووانیش، بۆیە وا پێویستە کە تۆ بەشێوەیەک وەڵامی پرسیارەکەی بدەیتەوە کە ئەوەی ئەو مەبەستیەتی بەسەر خۆیدا بشکێتەوە و خۆی ببێتە جێگای پێکەنینی دەوروبەر، هەروەها تا جارێکی تر جورئەتی ئەوە نەکات کە پرسیاری لەو شێوەیە ئاڕاستەی تۆ بکاتەوە.

ئەمە بەشێکن لەو پرسیارانە کە زۆرجاران بە مەبەستی گاڵتەکردن بە ئاستی یەکتر لە لایەن کەسانێکەوە ئاڕاستە دەکرێن.

- پرسیار: چی دەزانی دەربارەی سەرکردەکانی جەنگی جیهانی یەکەمەوە؟
- وەڵام: هەموویان مردوون.

- پرسیار: ڕۆمانیەکان دوای ئەوەی لە ڕووبارەکە پەڕینەوە چیان کرد؟
- وەڵام: جلەکانیان وشک کردەوە.

- پرسیار: ئوستڕالیا دورترە یان مانگ؟
- وەڵام: ئوستڕالیا، چونکە مانگ دەبینین، بەڵام ئوستڕالیا نابینین.

- پرسیار: ڕەگەزی عەلی بابا نێر بووە یان مێ؟
- وەڵام: نێر، چونکە ئەگەر مێ بوایە پێیان دەوت: (عەلی دایە).

- پرسیار: ئەگەر (٥) پانتۆڵ و (٥) قەمیس و (٤) پێڵاومان هەبێ، بەشی چەند کەس دەکات؟
- وەڵام: بەشی پێنج کەس دەکات، بەڵام یەکیان پێ خواس دەبێ.

- پرسیار: سودی گوێچەکەکان چییە؟
- وەڵام: ئەگەر گوێچکە نەبوایە چاویلکەکان بە سەر چاوەکانەوە ڕانەدەوەستان.

# چەند وەڵامێکی کەسایەتی (جوحا)

## جوحا کێیە؟

ناوێکی دیار و بەرچاوی نێو کەلتوری چەندین گەل و نەتەوەیە، ناوێکە کە هەر لەگەڵ بیستنیدا پێکەنین و زەردەخەنەت بیر دەکەوێتەوە، بەشێک لە مێژوونوسان پێیان وایە کە جوحا تەنها ناوێکی وەهمیە و دراوەتە پاڵ کۆمەڵە وەڵام و پەند و چیرۆکێک.... وتراویشە کە کەسایەتیەکی ڕاستەقینەیە، بەشێک لە مێژوونوسان بۆچونیان وایە کە جوحا لە ئەدەبی عەرەبیدا بە (دوجەینی کوڕی سابتی فیزازییە) وتراوە کە کونیەکەی (ئەبو غوسن) بووە و لە ساڵی (٦٠) کۆچی لەدایک بووە، لە ساڵی (١٦٠) کۆچیش لەسەردەمی خەلیفە هارون وەفاتی کردووە.

وتراویشە جوحا بە ئەصل تورکیە و ناوی (نەسرەدین خۆجە ڕۆمیە) لە ساڵی (٦٠٥) کۆچی لە دایک بووە و لە ساڵی (٦٨٣) کۆچی دوایی کردووە.

جگە لەوەی هەمان ناو دراوەتە پاڵ چەندین کەسایەتی تریش، وەک ئەبو نەواسی بەغدادی، ئەبو غەبشانی خوزاعی، عەجیلی کوڕی لەجیم، هەمزەی کوڕی بەیز، ئیبنو جەساس...

بەلام ئەوەی بۆچوونی ئەو مێژوونوسانە بەهێز دەکات کە دەڵێن: جوحا کەسایەتیەکی وەهیمیە ئەوەیە کە ناوی جوحا لە کەلتوری گەلێکەوە بۆ گەلێکی تر گۆڕدراوە، بۆنمونە، لە ئەدەبی عەرەبی پێ دەڵێن جوحا، لە ئەدەبی فارسی و تورکی بە مەلا نەسرەدین ناوی تۆمارکراوە، لە ئەدەب و کەلتوری کوردی خۆمانیش بە مەلای مەشهور...ئەمە لەکاتێکدا زۆرێک لە چیرۆکەکان لە گشت ئەدەب و کەلتورەکان هەمان چیرۆکن.

- جارێکیان جوحا بە غەمباری لەبەر دەرگای ماڵەکەی دانیشتبوو، لەو کاتەدا کەسێکی گەردوونناس کە بانگەشەی علمی غەیبیشی دەکرد بەلایدا تێپەڕ دەبێت و بە جوحا دەڵێ:
- ها جوحا بۆ وا غەمباری؟ وەرە (١٥) دیرهەم بە من بدە تا داهاتووی خۆتت بۆ ڕوون بکەمەوە و لەو غەمانە ڕزگارت بکەم.
جوحاش وەلامی دایەوە و وتی:
- بڕۆ غەمێک لە حاڵی خۆت بخۆ هەی گەمژە، ئەگەر علمی غەیبت زانیبا دەتزانی کە من (١) دیرهەمم لە گیرفاندا نیە تا نانی نیوەڕۆی پێ بخۆم.

- جوحا هاوڕێیەکی هەبوو باوەڕی وابوو کە ڕوحەکان لە نێوان کەسەکان دەگوزارێنەوە، واتە کە کەسێک دەمرێت ڕوحەکەی دەچێتە بەر کەسێکی تر، ڕۆژێکیان ئەو هاوڕێیەی جوحا پرسیاری لە جوحا کرد:
- ئەی جوحا پێت وایە ئەو ڕوحەی ئێستا من هەمە پێشتر هی کێ بووە؟
جوحاش بێ ئەوەی خۆی تێک بدات وتی:
- هی کەرە بۆرە تۆپیوەکەی من.

- سێ ئافرەت لە سەر بابەتێک ناکۆکیان لە نێوان دروست دەبێت، بڕیار دەدەن بچنە لای جوحا بۆ یەکلایی کردنەوەی بابەتەکەیان، کاتێک دەچنە لای جوحا هەر سێکیان پێکەوە قسە دەکەن، جوحا چەند جارێک پێیان دەڵێ بە نۆرە قسە بکەن تا لە بابەتەکە تێبگەم، بەڵام بێ سود بوو، هەر کەسە و لەڕاست خۆی قسەی دەکرد.
جوحا بیری کردەوە کە چۆن وایان لێبکات بێ دەنگ بن، دوای کەمێک جوحا وتی:
- کامەتان لە هەموویان بەتەمەنترە با قسە بکات!
هەموویان بێ دەنگ بوون، چونکە هیچ کامیان خۆیان بە بەتەمەن نەدەزانی.

• پیاوێکی بەناو زانا دێتە گوندەکەی جوحا، لە خەڵکی گوندەکە دەپرسێ:

- کێ زانا و داناى ئێوەیە؟

خەڵکی گوندیش تێکڕا دەڵێن:

- جوحا.

- بەناو زاناکەش دەڵێ: دەکەواتە بمبەن بۆ لای ئەو.

بەناو زاناکە لەگەڵ جوحا لە ئەحوالی یەکتر دەپرسن، دواتر بە جوحا دەڵێ:

- ئەی جوحا من (٤٠) پرسیارت لێدەکەم، بەڵام تۆ دەبێت هەر (٤٠) پرسیار بە (١) وەڵام، وەڵام بدەیتەوە.

جوحاش بە سەرسامیەوە وتی:

- بە (١) وەڵام؟!

- بەناو زاناکەش وتی: بەڵێ.

جوحا کە زانی ئەو کەسە زۆر تەواو نیە و هیچی وای لە هەگبەدا نیە، وتی:

- باشە ڕازیم، پرسیارەکانت بکە.

کابرای بەناو زانا هەر (٤٠) پرسیاری ئاڕاستەی جوحا کرد، دواتریش تەماشای جوحای کرد و وتی:

- ئێستا نۆرەی تۆیە، وەڵامم بدەوە.

جوحاش وتی:

- وەڵامەکەیان ئاسانە، هەزار پرسیاری وا بە یەک وشە وەڵام دەدەمەوە!

- کابرا کە زۆر لای سەیر بوو، وتی چۆن؟ ئەوە چ وشەیەکە؟

- جوحا وتی: (نازانم).

کابرا زۆر تورە بوو و هەستا ڕۆژیشت.

- هاوڕێیەکی جوحا بە جوحای وت:

- ئەگەر کەرێک لە ڕێگا دوو سەتڵ ببینێ، یەکێکیان پڕ لە زێر بێت، ئەوەی تریان پڕ لە ئاو، بە بۆچونی تۆ کەرەکە کامەیان هەڵدەبژێرێت؟

- جوحا وتی: ئاوەکە.

هاوڕێیەکەی وتی: بۆچی؟

- جوحا: چونکە کەرە.

- گەنجێک هەبوو زۆر شانازی بەخۆی دەکرد، هەمیشە دەیوت:

- کەس ناتوانێ فێڵ لەمن بکات، کەس ناتوانێ گرەو لە من بباتەوە، کەس ناتوانێ شان لە شانم بدات لە فێڵ و تەڵەکە.

ڕۆژێکیان لە ڕێگادا جوحای بینی، بانگی جوحای کرد و وتی:

- ئەی جوحا تەنانەت تۆش ناتوانی فێڵ لە من بکەیت و لە خشتەم ببەیت!

- جوحاش وتی: بێگومان من دەتوانم فێڵ لە تۆ بکەم و لە خشتەت بەرم، ئەگەر باوەڕیش ناکەیت یەک کاتژمێر لێرە بوەستە تا دێمەوە بزانە چیت پێ دەکەم.

- گەنجەکەش وتی: ڕازیم، دەی برۆ من چاوەڕێتم.

جوحا ڕۆیشت، گەنجەکەش هەر لە جێگای خۆی وەستابوو، لە خەیاڵی خۆی دەیوت دەبێ جوحا چوبێت چی بکات؟ هەرچی دەهات لە گەنجەکەی دەپرسی کە بۆچی لەوێ وەستاوە، ئەویش دەیوت: چاوەڕێی جوحا دەکەم تا گرەوی لێ ببەمەوە.

خەڵکێکی زۆر لە دەوری گەنجەکە کۆبووبوونەوە، دوای کاتژمێرێک جوحا گەڕایەوە، گەنجەکە بینی جوحا هیچی پێ نیە، وتی:

- ها جوحا بۆچی ڕۆیشتی، خۆ هیچت لەگەڵ خۆت نەهێناوە؟

جوحاش وتی: ڕۆیشتم چایەکم خواردەوە و هاتمەوە، بەس نەمزانی هێندە بێ عەقڵی و هەر لە جێگای خۆت دەمێنیتەوە!

ئەوانەی لەوێ بوون هەموویان دایانە قاقای پێکەنین، گەنجەکەش سەری شۆر کرد و زانی لەگەڵ جوحا دۆرا.

- کەسێک لە جوحای پرسی:

  - ئەگەر ویستم لەگەڵ دارجەنازەیەک بچم بۆ گۆرستان، لە دوای دارجەنازەکە برۆم یان لە پێشیەوە؟

  جوحاش وتی:

  - ئەگەر خۆت لە ناو دارجەنازەکە نەبویت ئەوا چۆن ئارەزووت کرد ئاوا برۆ.

- دوو کەس دەبێتە مشتومڕیان و بۆ یەکلایی کردنەوەی پرسەکەیان دەچنە لای جوحا، کە دادوەری ئەو ناوچەیەی دەکرد، یەکێکیان وتی:

  - جەنابی دادوەر، ئەو پیاوە کۆڵێکی قورسی هەڵگرتبوو، کەوتە سەر زەوی و داوای لە من کرد یارمەتی بدەم، منیش وتم: ئەگەر یارمەتیت بدەم چیم دەدەیتێ؟ ئەویش وتی (هیچ).

  منیش ڕازی بووم و یارمەتیم دا.

  ئێستاش داوای لێدەکەم کە (هیچەکە)م پێبدات، کەچی ئەو پێم نادات.

جوحا وتی:

- سکاڵاکەت لەجێگای خۆیەتی، وەرە پێشەوە، ئەو کتێبە بەرز بکەرەوە، سەیری ژێرەکەی بکە، کاتێک بەرزی کردەوە پێی وت:

- چی لە ژێردایە؟

پیاوەکە وتی: هیچ.

جوحا وتی: دەی هەڵیبگرە بۆخۆت و بڕۆ.

• جارێکیان جوحا لەسەربانی ماڵەکەی بوو، کەسێک لە دەرگایدا و جوحاش هەر لەسەربانەوە وتی:

- ها چیت دەوێ ئەی پیاو؟

- کابراش وتی: تۆ وەرە خوارەوە ئینجا پێت دەڵێم.

جوحاش چووە خوارەوە و بە کابرای وت:

- ها ئەوە هاتم، ئێستا بڵێ چیت دەوێ؟

- کابراش وتی: هەژار و دەست کورتم، هاتووم تا خێرێکم پێ بکەیت و شتێکم پێ بدەیت.

جوحا زۆر توڕە بوو، بەڵام دەرینەبڕی، بە کابرای وت: وەرە بە دوام کەوە، تا چووە سەربان، ئەوکات ئاوڕێکی لە کابرا دایەوە و وتی:

- خودا بتداتێ.

سواڵکەرەکە وتی:

- بۆ هەر لە خوارەوە پێت نەوتم؟
جوحاش وتی:
- ئەی تۆ بۆ منت هێنایە خوارەوە، بۆ هەر لەسەرەوە پێت نەوتم چیت دەوێ.

- کۆمەڵێک کەس ڕێککەوتن کە جوحا لەگەڵ خۆیان ببەن بۆ حەمام و لەوێ گاڵتەی پێ بکەن و پێی پێبکەنن.
هەریەکەیان هێلکەیەکی لەگەڵ خۆی برد و کاتێک ڕۆیشتنە ناو حەمامەکە وتیان:
- وەرن با هێلکە بکەین و ئەوەی نەیتوانی هێلکە بکات ئەوا دەبێت کرێی خۆشۆردنی هەمووان بدات.
هەریەکەیان وەک مریشک دەستی دەکرد بە گارە گار، پاشان هەریەکە و لەبن خۆی هێلکەیەکی دەردەهێنا، تا سەرەی جوحا هات، جوحا هەستاو وەکو کەڵەشێر دەیخوێند و بەدەوریاندا دەسوڕایەوە.
پێیان وت:
- ئەوە چیە جوحا بۆ وا دەکەی؟
جوحا وەڵامی دانەوە و وتی:
- ئایا نابێت کۆمەڵە مریشکێک کەڵەشێرێکیان هەبێت؟

# سەرچاوەکان

- **قورئانی پیرۆز.**

- **تەفسیری ئاسان** (بۆ تێگەیشتنی قورئان)، بورهان محمدأمین.

- **الأجوبة المسكتة**، للأستاذ إبراهيم بن عبد الله الحازمي، الشريف للنشر والتوزيع.

- **الأجوبة المسكتة**، إبراهيم بن أبي عون، تح: مى أحمد يوسف، ط: عين للدراسات والبحوث الإنسانية والاجتماعية، القاهره، ط١٩٩٦ ،١ م.

- **المستطرف في كل فن مستطرف**، شهاب الدين محمد بن أحمد بن منصور الأبشيهي أبو الفتح (المتوفى: ٨٥٢هـ)، عالم الكتب - بيروت، ط ١، ١٤١٩ هـ .

- **قصص العرب**، موسوعه تراثية جامعة لقصص ونوادر وطرائف العرب في العصور الجاهلي و الإسلامي، إبراهيم شمس الدين، دار الكتب العلمية -بيروت- لبنان، ٢٠٠٢.

- **متعة الحديث**، جمع وإعداد، عبدالله بن محمد بن راشد الداوود، مكتبة الملك فهد الوطنيه، الرياض، ٢٠١٨ .

- **أخبار الأذكياء**، جمال الدين أبي الفرج عبدالرحمن بن علي بن الجوزي، القرشي البغدادي، دار ابن حزم، بيروت- لبنان، ٢٠٠٣.

- **جواب الأذكياء**، عبدالسلان بن صالح العييري.

- **الفكاهة و المزاح عنـد الـعرب**، ياسين طاهر الأغا.

- **حتى لا تقع فريسة لزلة لسانك**، ماتياس بوم، نقله الى العربية : د. إلياس حاجوج، مكتبه العبيكان.

- **تاريخ بغداد**، للخطيب، البغداد، طبعة الكتب العلمية.

- **عقلاء المجانين**، أبو القاسم الحسن بن حبيب النيسابوري، تحقيق: د. عمر الأسعد، دار النفائس، الطبعة الأولى، ١٩٨٧.

- **النوادر والطرائف**، الفكاهة في الشعر العربي، سراج الدين محمد، دار الراتب الجامعية.

- **طرائف المضحكين** من الملوك والشعراء والحمقى والمغفلين، محسن عقيل، مؤسسة الأعلمي للمطبوعات.

- **الثقلاء** أخبار و طرائف، أزهرى أحمد محمد، دار الطويق.

- **ربيع الأبرار، نصوص الأخبار**، أبي القاسم بن محمود بن عمر الزمخشري، مؤسسة الأعلمي، بيروت- لبنان، ١٩٩٢م.

نوسەرێک بە بێرنادشۆ ی وت:
من لەتۆ باشترم چونکە تۆ
بۆ دەستکەوتنی پارە ئەنوسی
بەڵام من بۆ دەستکەوتنی شەرەف!
بێرنادشۆ وەڵامی دایەوە:
راستەکەی!!
هەریەکەمان بۆ ئەوە ئەنوسێ
کە نییەتی!



بەرگ : ئیبراهیم سالح

bookstore
ZANYAR